# چیرۆکە کاریگەرەکان

# بۆ کورانی لاو

## کۆمەڵە چیرۆکێکی واقعی و پەروەردەیی

ن/أحمد سالم بادویلان
و/حسێن محمود هەڵەبجەیی



یەکەم چاپ
هەولێر ۲۰۱۲





ناو: چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ کورانی لاو.

بابەت: چیرۆکی ڕاستەقینە.

نوسەر: ئەحمەد سالم بادویلان.

وەرگێر: حسێن محمود هەڵەبجەیی.

پێداچونەوە: وەرگێر.

کاری کۆمپیوتەر: نوسینگەی MOM ‏٠٦٦/ ٢٦٤٨٩٠٧ N.

پاك نوسكردن: عبدالرحمن عبدالله.

چاپخانە: پالیت

چاپ: دووەم ٢٠١٢.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

ژمارەی بەرهەم ﴿١٠٩﴾.

نرخ: ٢٠٠٠ دینار.

بۆ: فرۆشتن و بلاوکردنەوە: M / ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤.

بۆ: هونەرکاری وچاپکردن: M / ٠٧٥٠١١٨١٩١٩.






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە




بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ: فرۆشتن، چاپکردن، بلاوکردنەوە.

(هەولێر - کوردستان - عراق)

(٠٦٦ ٢٢ ٢٢ ٨٦٨)

# چیرۆکە کاریگەرەکان

# بـــۆ

# کوڕانی

# لاو

ن/ئەحمەد سالم بادویلان.
و/حسێن محمود هەڵەبجەیی.

دووەم چاپ
هەولێر ٢٠١٢.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## • پێشەکی

الحَمْدُ لله رَبِ العَالَمِين، وأَفْضَلُ الصَلاةِ وَالسَلامُ عَلى نَبِينا مُحَمَد، وعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين، وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإَحْسانٍ إلى يَوْمِ الدِين.

**پاشان: مەبەست لە باسکردنی چیرۆکەکان دوورخستنەوەی لاوانە و سوود وەرگرتنە، سوود وەرگرتنیش بە پەند وەرگرتنە، وە ئەگەرنا ئەوە ئەو سوودە نەهاتووەتە دی.**

**ئێمە لەم کتێبەدا (قصص مؤثرة للشباب) ئەو ڕێبازەمان گرتووەتە بەر کە چۆن کەسێك بەرووبوومی گەییووی لێدەکاتەوە و دەیکاتە ناو سەبەتەیەکی جوانەوە، ئەو کاتە لە ڕووی ڕێکخستن و شێوازەوە ڕواڵەتمان هێناوەتە دی و لە ڕووی بیرۆکەیشەوە هەواڵێکی دروست.**

**هەموو ئەم چیرۆکانە بریتی نین لە خەیاڵ و ئەندێشەی نووسەرێکی بە توانا و دروستکراوی ئەدیبێکی داهێنەر نین، بەڵکو ڕووداو گەلێکن لەم جیهانەماندا ڕوویانداوە و**

پاڵەوانەکانیش کەسانی راستەقینەن و لە سەر ئەم هەسارە بچوکەمان دەژین، ئەم چیرۆکانە ئەو راستەقینە نەمرەت نیشان دەدەن کە خوای گەورە لە سەرووی تۆوەیە و قەدەری ئەو چاوەڕوانی تۆیە، وە هەر دەبێت رۆژێك لە رۆژان بێت و بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و دەربازبوون نیە.

برای لاو، ئەم کۆمەڵە پەندە بە ووردی هەڵبژێراوە تا زۆرترین توێژەکان و شێوازەکان بگرێتەوە بۆ بەدیهێنانی مەبەستی خوازراو، ئەگەر لاوێك لە چیرۆکێکدا ئەوەی بەدی نەکرد ئەوا لە چیرۆکێکی تردا بەدی دەکات .

ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە: بۆچی بە تەنها لاوان؟ کەس لە ئێمە ناتوانێت نکولی لە گرنگی لاوان بکات ، بە ڵکو ناتوانین خۆمان بێئاگا بکەین لە فەرمایشتی خوای گەورە سەبارەت بە هاوەڵانی ئەشکەوت ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾ واتە:( بەراستی ئەوان کۆمەڵێك لاو بوون باوەڕیان هێنابوو بە پەروەردگاریان و ئێمەش زیاتر رێنمونیمان کردن) کەواتە رۆڵی لاوان لەم جیهانەدا رۆڵێکی گەورەیە، ئەوان



ئاییندەیەکی نزیکی ئەم نەتەوەیەن، بەرپرسیاریەتی گەیاندنی ئاین بە بەندەکانی خوا لەسەر ئەوانە، بە کردەوە و جێبەجێکردن نەك بە ووتە و دروشمەکان، هیچ کەسێك ناتوانێت کە بێئاگا بێت لە مەینەتیەکانی لاوان لەم سەردەمەماندا، لەبەر ئەوە پێویستە چارەسەر پێشکەش بکرێت بۆ لابردنی مەینەتیەکانیان و دامەزراوکردنیان و هاندانیان بۆ وەستان لەبەردەم ئاوێنەدا تا بەهای خۆیان و راستەقینەیی پێگەیان بزانن و بەرەو رووی بەرپرسیاریەتیان ببنەوە لەم ژیانەدا بە گیانێکی ئیسلامیانەوە و بە هەموو ئەو شتانەی کە لە ئیسلامدا هەیە لە رەحمەت و بەزەیی و داوێنپاکی و رەوشت و کاری جوان.

وە ئێمە ئەم رێبازەمان بۆیە گرتەبەر لە خوا داواکارین خۆمان پەندی لێ وەربگرین پێش خوێنەرانی بەرێز و سوودی خوازراوی هەبێت بۆ خۆمان و ئێوە و هەموو موسڵمانان.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِهِ وَ صَحْبِهِ
وَ آخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِين

دانەر

## پاداشتی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا

شوێنی گۆڕی، منیش هەستم بە مژدەی خێر و بێر دەکرد، زانیم و هەستم کرد کە بەڕاستی بەهەشت هاتووە بۆ ماڵمان نابێ ئەو فرسەتە لە دەست بدەم، گەشتە ماڵمان وەك چۆن بووکێك دەگاتە ماڵی خۆی، هەرکە بنە و بارگەی دانا لە ماڵمان، هەموومان بەم دەست و بەو دەست خزمەتمان دەکرد و شەونخونیمان دەکێشا بۆ پشوودانی، دایکم رۆژنامەکانی بۆ خوێندەوە تا ئاگاداری هەواڵەکان بێت چونکە زۆرحەزی لێی بوو، منیش خواردنم پێدەدا و سوور بووم لەسەر پێدانی دەرمانەکانی.

رۆژەکان و مانگەکان تێپەڕین و نەنکم تووشی جەڵدەی دڵ بوو، خرایە نەخۆشخانەوە و دیمەنێکی سەیرم بینی کە زۆر کەم لە نێو کوڕان و کچانی ئەمڕۆدا هەیە، ئەویش کاتێك کە دەمامکەکە نرا بە روویەوە بۆ وەرگرتنی ئۆکسجین، پەنجەی شایەتوومانی بەرزکردبوویەوە و یادی خوای گەورەی دەکرد، دوای تێپەر بوونی چەند رۆژێك هاتەدەر لە نەخۆشخانە، نزیکەی زیاد لە سی ساڵ دەبێت

نەنکم بەردەوام ڕۆژە سپیەکان(ایام البیض )ی هەموو مانگەکانی دەگرت و مانگی شەعبان و ڕەمەزان و شەوالیشی بە تەواوی دەگرت و بە ڕۆژوو دەبوو، ڕێکەوتی ڕۆژی عاشورا بوو، نەنکم بە ڕۆژوو بوو بە پێچەوانەی فەرمانی پزیشك کە ڕێنمایی کردبوو پابەند بێت بە کاتەکانی دەرمان خواردنەوە و هەر دواکەوتنێك ڕوووبدات کاریگەریی دەبێت لەسەر دڵی .منیش دوای نوێژی خەوتنان سەرم لێدا و ویستم بڕێك پارەی بدەمێ بە بۆنەی دەرچوونم لە زانکۆ، ئەویش پێکەنی و ئەم دوعایەی بۆ کردم (الله یوفقك الله یحفظك الله یخلیك) واتە (خوای گەورە ڕابەردارت بکات، خوای گەورە بتپارێزێت، خوای گەورە یارمەتیدەرت بێت) بە بیرم هێنایەوە کە نابێت بە ڕۆژوو بێت بە پێی ڕێنمایی پزیشك، ئەویش دڵنیایکردم کە باشە... چووم تا بخەوم لەوکاتەدا کە خەریك بوو بانگی بەیانی بدرێت گوێم لە تەقەی دەرگای ژوورەکەمەوە بوو، بینیم خزمەتکارەکەمانە و هەواڵی پێدام کە نەنکم کەوتووەتە سەر زەویەکە و منیش بە پەلە ڕامکرد بۆ

ژوورەکەی، بینینم بەسەر زەویەکەدا راکشاوە و روخساریشی رووە و قیبلەیە و دەستی راستیشی خستووەتە سەر دەستی چەپی وەك ئەوەی لە نوێژدا بێت و دەرمانەکانیشی نەخواردبوو، دەستم خستە سەری و بینیم کە ماڵئاوایی لە دنیا کردووە و رۆحی پاکی بەرزەفربووە بۆ لای پەروەردگار و بە رۆژووش بوو.

دوای وەفاتکردنی بە سێ مانگ کاتی ئەوە هاتبوو پێداویستیەکانم پێشکەش بە وەزارەتی پەروەردە بکەم بۆ دامەزراندم لە قوتابخانەیەکی نزیك ماڵمان، سەرۆکی بەشەکە داوای لە سکرتێرەکەی کرد کە دۆسیەی داواکاریەکان بهێنێت چونکە بڕوای بە (واسیتە) نەبوو، هەموو کەس لای ئەو یەکسان بوون، بینی هەموو قوتابخانەکان پێویستیان بە مامۆستا هەیە تەنها ئەو قوتابخانەیە نەبێت کە مەبەستی من بوو، چونکە ئەو قوتابخانەیە پێویستی بە مامۆستا نەبوو، بۆیە منیش زۆر دڵتەنگ بووم بەوە و وتی دڵتەنگ مەبە بەڵام رۆژی شەممە

سەرم لێبدەرەوە بەڵکو شتێك رووبدات، منیش وتم: إنشاء الله.

دوو رۆژ تێپەڕی وەك دوو مانگ وابوو ، منیش چاوەروانی رۆژی شەممەم دەکرد ، رۆژی هەینی شەوەکەی خەوتم، لە خەومدا بینینم نەنکم رەحمەتی خوای لێبێت سەردانم دەکات و هەواڵم دەپرسێت و لۆمەم دەکات چونکە ماوەیەکە نەیبینیبووم، پێم ووت سەرقاڵی دنیا رێی لێگرتووم، وتی (روح الله یوفقك، الله یحفضك، الله یخلیك) هەمان ئەو دوعایە کە بۆی کردم پێش وەفاتکردنی بە پێنج سەعات.. لە خەوەکەم هەستام و زۆر دڵخۆش بووم بەو خەوە بە پەلە چوومە لای سەرۆکی بەشەکە و لێم پرسی چی بووە ؟ وتی هیچ رووی نەداوە بەلاّم با چاو بخشێنمەوە بە فایلی داواکاریەکاندا سکرتێرەکەی بانگ کرد کە فایلەکانی بۆ بێنێت، هەر کە کردیەوە شتێکی سەیری بینی... بینی هەموو ئەو قوتابخانانەی مامۆستایان دەوێت ئێستا مامۆستایان ناوێت و ئەو قوتابخانەیەیشی داخرابوو ئێستا پێویستی بە مامۆستایە بۆیە زۆر تووڕە

بوو لە سکرتێرەکەی و تاوانباری کرد بە کەمتەرخەمی و هەڵەکردن، بۆیە کچەکە لە نوسینگەکە هاتەدەرەوە و سوپاسی خوای دەکرد لەسەر ئەو رۆزیە کە دەرگایەکی داخراوی لێکردەوە (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ).

## چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا

ئێوارەیەکیان دایکە لەگەڵ منداڵەکانیدا دانیشت و یارمەتی دەدان لە پێداچوونەوەی وانەکانیادا و ئەو منداڵەی کە تەمەنی چوار ساڵ بوو دەفتەری وێنەکێشانەکەی دابەدەستیەوە تاوەکو ئەم سەرقاڵ نەکات و بتوانێت وانە بەوانیتر بڵێتەوە.

لە پڕ بیری کەوتەوە کە خواردنی ئێوارەی ئامادە نەکردووە بۆ باوکە بە ساڵاچووەکەی مێردی کە لە گەڵیاندا دەژیا لە ژوورێکدا و لە گۆشەیەکی ماڵەکەیاندا، چەندەی لە تواناداد هەبووایە هەڵدەستا بە خزمەتکردنی، مێردەکەشی رازی بوولە خزمەتکردنی ئەو بۆ باوکی، چونکە باوکی بە هۆی ناساغیەوە لە ژوورەکەی نەدەهاتە دەرەوە، بە پەلە خواردنی بۆ برد و لێی پرسی ئایا پێویستی بە هیچ شتێکی تر نیە و پاشان رۆشتە دەرەوە، کاتێ گەرایەوە بۆ لای منداڵەکانی، هەستی کرد کە منداڵە بچوکەکەی خەریکی وێنەکێشانی بازنە و چوارگۆشە و دانانی ئاماژەیە لێی پرسی: ئازیزم ئەوە وێنەی چی دەکێشیت؟

منداڵەکەش بەوپەڕی بەرائەتەوە وەڵامی دایەوە: من وێنەی ئەو ماڵە دەکێشم کە کاتێک گەورە دەبم و ژن دەهێنم و تێیدا دەژیم، وەڵامدانەوەکەی دڵخۆشی کرد.. وتی: ئەی لە کوێ دەخەویت ؟منداڵەکەش چەندین چوارگۆشەی پێ نیشاندا و دەیووت ئەمە ژووری نووستن و ئەویان مەتبەخ و ئەوی تریان ژووری میوانە.. بۆیە دەستی کرد بە ژماردنی هەموو ئەوانەی کە دەیزانی لە ماڵەکەدان، پاشان چوارگۆشەیەکی لە دەرەوەی چوارچێوەکە کێشابوو.

دایکیشی سەرسام بوو، پێی وت: بۆچی ئەو ژوورە لە دەرەوەی ماڵەکەدایە و جیایە لە هەموو ژوورەکانی تر؟ لە وەڵامدا منداڵەکە وتی ئەوە ژووری تۆیە، تۆ دەخەمە ئەوێ و لەوێدا بژیت وەك چۆن باپیرە گەورەم لەوێدا دەژی.

دایکی بە بیستنی قسەی منداڵەکەی تووشی شۆك بوو!! بۆیە لە خۆی دەپرسی ئایا دەبێت من بە تەنها لەو چۆڵەوانیەدا لە دەرەوەی ماڵەوەدابم، بە بێ ئەوەی لەزەت ببینم لە قسەکردن لەگەڵ کوڕەکەم و منداڵەکانیدا و

دڵخۆش ببم بە قسەکانیان و شادیان و یاریان کاتێ کە لە جوڵە دەکەوم؟ ئەو کاتە قسە لەگەڵ کێدا بکەم؟ ئایا هەموو تەمەنم لە نێو ئەم چوار دیوارەدا بەسەربەرم بەبێ ئەوەی گوێم لە دەنگی ئەندامانی خێزانەکەم بێت.

بە پەلە کارگوزارەکانم بانگ کرد و بەخێرایی ژووری تایبەت بە میوانمان گواستەوە کە رازاوەترین ژوورە و دیارترینیان بوو، کەلوپەلی مامم (باوکی مێردەکەم) ئامادەکرد و کەلوپەلی تایبەتی ژووری میوانیشم گواستەوە بۆ ئەو ژوورەی دوور بوو لە خانووەکە .

کاتێ مێردەکەی گەڕایەوە لە دەرەوە سەرسام بوو بەو کارە چونکە چاوەڕوان نەکراو بوو.. لە خێزانەکەی پرسی: چی وای لێکردێت ئەو گۆڕانکاریە بکەیت؟

بە چاوانی پر لە فرمێسکەوە وەڵامی دایەوە من جوانترینی ژوورەکان هەڵدەبژێرم من و تۆ تیایدا بژین ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێداین و لە جموجوڵ کەوتین، با میوانەکان لەو ژوورەی دەرەوە بن.

مێردەکەشی لە مەبەستەکەی تێگەیشت و ستایشی ئەو کارەی کرد کەبەرامبەر بە باوکی ئەنجامی دابوو کە ئەویش بە رووخساری پڕ لە خەندەوە تەماشای دەکردن و منداڵەکەش تەنها ئەوەی بۆ مایەوە وێنەکەی کوژاندەوەو خەندە گرتی.

بچوکترین خوێندکار کە ماستەری بە دەستهێنا بوو لە ئەمەریکا، رۆشت تا خۆی بکوژێت بەڵام بوو بە بانگخواز!!

خوێندکاری ئەمریکی(جیف) رۆشت بۆ لای راگری زانکۆ کە بانگی کردبوو تا پیرۆزبایی بەدەستهێنانی ماستەرنامەکەی لێبکات بە پلەی نایاب و یەکەم بە دەستی هێنابوو و هەروەها پیرۆزباییەکە بە هۆی ئەوەشەوە بوو کە بچوکترین خوێندکار بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە ماستەری لەو پسپۆریەدا بەدەست هێنابوو، ئەمەش دەستکەوتێکی ناوازە بوو بە نیسبەت زانکۆکەوە کە شانازی بە خوێندکار (جیف)ـەوە بکات چونکە دەستکەوتێکی مێژوویی بەدەست هێنابوو دوای یەکتربینینەکە جیف ژووری سەرۆکی زانکۆی بەجێهێشت

کە غەم و پەژارە بەرووخسارییەوە دیاربوو بە پێچەوانەی قوتابیانی ترەوە لە ئاوا بۆنەیەکدا، ئەوانەی بە زاری ئەمریکی هاوار دەکەن(یاهوورو)لەسەر شێوازی کاوبۆی یان بەخێوکەرانی مانگا لە ئەمەریکا یان هاوار دەکەن (ئۆلرایت ).

بەڕێوەبەرەکە سەرسام بوو بەلام لێی نەپرسی و پرسیاری نەکرد کە چی لە ناخی (جیف)دایە، لە مەوعیدی دیاریکراو بۆ ئاهەنگی دەرچوون جیف بەوپەری کەشخەیەوە بە جلی تایبەتی خۆی بۆ بۆنەکان ئامادەبوو و رۆبی دەرچوونی لەبەرکردبوو،کلاوی دەرچوونیشی لەسەر کردبوو، چووە شوێنی خۆی دانیشت کە تایبەت کرابوو بۆی، گوێی لە ناوی خۆیەوە بوو لە رێی بلندگۆکانەوە بەرزدەبوویەوە کە پڕیبوو لە ستایش و سوپاسکردن کە لە لایەن هەموانەوە ئاراستەی دەکرا بە هۆی ئەو دەستکەوتە ناوازەیەوە، پاشان چووە سەر سەکۆ تایبەتەکە تا بڕوانامەکە وەرگرێت لە نێو ئاپۆڕای چەپلە و هوتافی خێزانەکەی و هاوڕێکانی و ئامادەبووانەوە لەو جۆرە

بۆنانەدا ، کاتێ جیف بڕوانامەکەی وەرگرت دەستی کرد بە گریان و سەرۆکی زانکۆش بە سوعبەتەوە پێی ووت (تۆ بە هۆی ئەوپەڕی شادمانیتەوە بۆ ئەو دەستکەوتە مەزنە دەگریت)

جیفیش وەڵامی دایەوە: (نەخێر: بەڵکو بە هۆی ئەوپەڕی نابەختەوەریەوە دەگریم) سەرۆکی زانکۆش سەرسام بوو بۆیە لێ پرسی:(بۆچی کوڕی خۆم پێویستە ئەمڕۆ تۆ زۆر دڵخۆش و شادومان بیت بە تایبەتی لەم ساتەوەختەدا)

جیف وتی:(من وام گومان دەبرد شادرومان دەبم بەم دەستکەوتە، بەڵام وا هەست دەکەم من هیچم نەکردووە لە پێناوی بەختەوەرکردنی خۆمدا و من ئێستا هەست بە نابەختەوەریەکی زۆر دەکەم، نە بڕوانامەوە و نە پلەی زانستی و نە ئاهەنگەکە من بەختەوەر ناکەن).

پاشان جیف بڕوانامەکەی وەرگت و بە خێرایی جێگاکەی بەجێهێشت لە نێو سەرسامی هەمواندا ئاهەنگەکەی تەواو نەکرد و نەمایەوە تاوەکو هاوڕێکانی و خزم و کەسە نزیکەکانی پیرۆزبایی لێبکەن.

جیف چوویەوە ماڵەوە و بڕوانامەکەشی بە دەستەوە بوو، ئەمدەست و ئەو دەستی پێدەکرد، پاشان کەوتە قسەکردن لە گەڵیدا: باشە من چی بە تۆ بکەم ؟ تۆ پلەیەکی مێژوویت بە مندا لە زانکۆکەدا و لە ئاییندەشدا پۆستێکی بەرز چاوەڕوانی من دەکات، وە خەڵکی و میدیاکان چاویان لەسەرم دەبێت بە هۆی ئەو دەستکەوتەی بەدەستمهێناوە، بەڵام ئەو بەختەوەریە کە من دەیخوازم پێت نەبەخشیم، من دەمەوێت لە ناخی خۆمدا بەختەوەر بم، هەموو شتێ لەم دنیایەدا بڕوانامە و پۆست و سەروەت و سامان و ناوبانگ نیە.

شتێکی تر هەیە کە پێویستە وامان لێبکات کە بەختەوەر بین... بێزار بووم لە ئافرەتان و عارەق و سەماکردن، شتێکم دەوێت دەروونم و دڵم بەختەوەر بکات... خوایە گیان من چیبکەم؟

رۆژگار تێدەپەڕی و (جیف) یش زیاتر نائاسوودەتر بوو، بۆیە بڕیاریدا سنوورێك و کۆتاییەك بۆ ژیانی دابنێت، بۆیە بەردەوام هەر بیری دەکردەوە هەتا بۆی دەرکەوت

باشترین ڕێگایەك کە کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێ بریتیە لەوەی کە لەسەر ئەو پردە بەناوبانگە خۆی فڕێداتە خوارەوە کە ئەمریکیەکان ناوێکیان لێنابوو کە لە جیهاندا ناوبانگی دەرکردبوو ئەویش بریتی بوو لە (قۆڵدن قیت) یان دەروازی زێرین کە شکۆدار دیارە وەك مامۆستایەکی شارستانی ئەمریکی و زۆر جار تەم ومژ دایپۆشیووە و ئەو پردە دادەنرێت بە گرنگترین ئادگاری ئەمریکی لە تەکنیکی و زانستیدا.

جیف کەوتە ڕێ و هەنگاوی دەنا بەرەو پردی زێرین و پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ لەو کەسانەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردبوون تا هەستن بە کۆمەڵێك ئەرکی بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە کە لاوانێکی موسوڵمان بون ڕۆشتبوون بۆ ئەمەریکا بۆ خوێندن، شوێنی نیشتەجێ بوونیان لە نزیك دەروازەی پردەکەوە بور کە لە ژوورێکدا و لە ژێر کەنیسەکەدا بوون.

رامێنن بە هۆی هەژاری و نەداریانەوە شوێنێکیان دەست نەکەوتبوو تیایدا نیشتەجێ بن تەنها ئەو ژوورە

نـەبێت لـە ژێـر ئـەو کەنیـسـەیەدا و هـەروەها خـەمی هەمیشەییان بانگەواز کردن بـوو بـۆ لای خـوای گـەورە و میهرەبان، خەمی ئەوەیان بـوو خـەڵکی بـانگ بکـەن بـۆ شوێنکەوتنی ئـاینی خـوای گـەورە، خـەمیان ئـەوە بـوو مرۆڤایەتی رزگار بکەن لە تاریکیەکانەوە بەرەو روونـاکی، خەمیان ئەوە بووبانگەواز بکەن و بە دانایی و ئامۆژگـاری چاك و ببنـە نموونەیـەکی جـوان و شـیرینی موسـڵمانانی راستەقینە، ئەوان دەیانخوێند و بانگەوازیشیان دەکـرد بـۆ لای خوای گەورە و لە ژێر ئـەو کەنیـسـەیەشدا نیـشتەجێ بوون، ئەوێیان دەست کەوتبوو، لەوانەیە خێـری تیـا بێـت بۆیان ئەو رۆژە چووبوونە دەرەوە تا بە ناو خەڵکیدا بگەرێن و بانگیـان بکـەن بـۆ موسـڵمان بـوون... پۆشـاکی ئیسلامیانەیان لەبەردابوو، روخسـاریان روونـاکی ئیمـانی لێ دەدرەوشایەوە... تەوێڵیان رووناکی هەڵگرتبوو بە هـۆی ئاسەواری کرنوش بردنیانەوە.. لە کاتی پیاسـەکردنی ئـەو رۆژەیاندا و لە نزیك دەروازەی زێرینەوە کوڕێکی ئەمـەریکی خەفەتباریان بینی، ئەو کوڕەش (جیف)ی خوێنـدکار بـوو

که بەسەرسامیەوە تەماشای لاوەکانی دەکرد، چونکە لە ژیانیدا کەسی بەو جل و پۆشاکەوە و بەو سەروسیمایە و بەو نوور و رووناکیەوە و بەو سەرنج راکێشانەیانەوە کە سەرنجی ئەمیان راکێشا بوو نەبینیبوو.بۆیە نزیك بوویەوە لێیان تا قسەیان لە گەڵدا بکات و پێی وتن: (ئایا دەتوانم پرسیارێکتان لێبکەم؟) یەکێکیان وتی:(بەڵێ فەرموو) جیف وتی: (ئێوە کێن و بۆچی ئەم پۆشاکەتان لەبەردایە؟) یەکێکیان لە وەڵامدا وتی: ( ئێمە موسڵمانین، خوای گەورە محمدﷺی بە پەیامبەر بۆ ناردووین تا ئێمە و خەڵکی تر دەربهێنێت لە ناو تاریکاییەوە بەرەوە رووناکی و بەختەوەری و خۆشی بێنێت بۆ مرۆڤەکان لە دنیا و قیامەتدا).

کاتێ جیف گوێی لە وشەی(بەختەوەری)ەوە بوو هاواری کرد وتی (بەختەوەری؟! من بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕێم، ئایا لای ئێوەی موسڵمان دەستم دەکەوێت؟!) ئەوانیش وەڵامیان دایەوە وتیان: (ئایینی ئێمە کە ئیسلامە ئایینی بەختەوەریە، ئایینێکە هەمووی خێر و چاکەیە،

لەگەڵماندابە بەڵکو خوای گـەورە ڕێنمایـت بکـات و تـام وچێژی بەختەوەری بکـەیت) ئـەویش پـێ وتـن:(مـن لـە گەڵتاندا دێم و تابزانم ئایا ئەو بەختەوەریەی من دەیخـوازم کـە بەختـەوەری ڕاسـتەقینەیە لای ئێوەیـە... مـن پـێش کەمێك دەمویست خۆم بکوژم، خەریك بوو لەم سەر پردە خۆم بخەمە خـوارەوە و کۆتـایی بـە ژیـانم بهێـنم، چـونکە بەختەوەری شك نابـەم، نـە لـە مـاڵ و سـامان و نـە لـە ڕابواردن و ئارەزووبازیدا و نە لە بڕوانامـەدا کـە بەدەسـتم هێناوە) ئەوانیش پێیان وت: (وەرە لە گەڵماندا تـا فێـری ئایینکەمانت بکەین بەڵکو خوای گەورە ئیمـان و لـەزەتی خواپەرەستی بخاتە دڵتەوە و ئاشنا ببێت بـە بەختـەوەری و لەزەتەکەی، چونکە خوای گـەورە توانـای بەسـەر هـەموو شتەکاندا هەیە).

جیف لە گەڵ لاوە موسوڵمانەکاندا لاوانی بانگخواز بۆ لای خوا ڕۆشت و گەشتە ئەو ژوورەی کە ئەوانی تێـدا بـوو کە وەك نوێژگەیەکی لێکرابوو بۆ خۆیان و بۆ کەسێك کـە بیەوێت خواپەرستی بکات تیایدا، بۆیە باسی ئیـسلامیان

کرد بۆ جیف و مەبەست و ئامانج و بنەما و جوانی مەزنی ئیسلامیان بۆ روونکردەوە.

ئەویش وتی:( بە راستی ئایینێکی جوانە، بەخوا لێرە ناجولێم هەتا نەیەمە ناو ئاینەکەتانەوە) بۆیە جیف موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند و ئەو برا بانگخوازانەش بە تەواوی تەعالیمەکانی ئیسلامیان فێرکرد، جیف دەستی کرد بە ئەنجامدانی فەرز و ئەرکەکانی ئیسلام و پۆشاکی ئیسلامیانەی پۆشی و رێگای راستی خۆی دۆزیەوە و بۆی دەرکەوت ئەو بەختەوەریەی کە بەدوایدا دەگەڕێت لە ئیسلامدا هەیە و لە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەیدایە.. بەڵکو جیف بەختەوەر بوو چونکە بوو بوو بە بانگخواز بۆ رێگای خوا لە ئەمەریکا، وە ناوی خۆی گۆڕی بۆ (جەعفەر)و وەکو دەزانین لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ کە پێغەمبەر بەڵێنی دابوو بە کوڕی مامی (جەعفەری کوری ئەبو تالیب) کە دووباڵی هەیە و لەبەهەشتدا پێی دەفڕێت و هەروەها جەعفەری ئەمەریکی لە خۆشی و بەختەوەریدا و بە هۆی هۆگربوونی

بە ئایینی ئیسلامەوە بە دوو باڵ دەفڕی.. بۆیە دەروونی و گیانی و ماڵ و سامانی و هەوڵ و تێکۆشانی وەقف کردبوو لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئایین لە ئەمریکادا.

ئەوەتا ئاشنا بووین بە بەسەرهاتی جەعفەر ئەو کەسەی کە بەختەوەری خۆی لە ئایینی خوا و پابەندبوون بە تەعالیمی خوا و پابەند بوون بە سونەتی پێغەمبەردا بنیەوە، ئیتر بۆچی زۆرێك لە موسڵمانان هێشتا لەو بڕوایەدان کە بەختەوەری خۆیان نابیننەوە تەنها لە لاسایکردنەوەی جولەکە و مەسیحیەکاندا نەبێت لە خواردن و پۆشاك و خواردنەوە و سواری و مەنزڵگا و تێکەڵیدا؟!!

بەخوا بەختیاری و ئەوپەڕی بەختیاری لەوەدایە کە ئادەمیزاد باوەڕی بە خوا و بە فریشتەکانی و بە پێغەمبەرەکانی و بە رۆژی دوایی و بە قەزا و قەدەر هەبێت.

بەختیاری و ئەوپەڕی بەختیاری لەوەدایە کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشەویستر بێت لە لای لە مندالەکانی و

لە دایك و بـاوك و مـالّ و سـامان و لـە خـودی خۆشـی، بەختیاری و ئەوپەڕی بـەختیاری لەوەدایـە کـە ئـادەمیزاد بانگخواز بێت بۆ لاي خوا، خۆی بەخت بکات لـە پێنـاوی خـوا بـۆ دەربـازکردنی خـەڵکی لـە تاریکاییەکانـەوە بـۆ رووناکی و رێنمونیان بکات بەرەو رێگای راست و دروست.

بەختیاری و ئەوپەڕی بەختیاری لـە موناجـاتی خـوای گەورەدایە لـە سـێیەکی شـەودا و بـەختیاری و ئەوپـەڕی بەختیاری لەوەدا بەدەسـت دێـت دەست بەسـەر هـەتیودا بهێنیت و سیلەی رەحم بەجێبهێنیت و چـاك بیـت لەگـەڵ دراوسێکاندا و دەم بەخەندە بیت بەرامبەر بـە رووخـساری براکەت و خێر و چاکە بکەیت بە دەستی راسـت و دەسـتی چەپت پێی نەزانێت، ئەمە بەختەوەری دنیایە ئەی ئـەبێت بەختەوەری رۆژی دوایی چۆن بێت.

جیف مـووسڵمان بوو، چونکە ئەو برایانـەی بینـی کـە پابەندن بە ئاینەکەیانەوە و بانگەواز دەکەن بۆ لای خوا لە خاکێکدا کە موسڵمانانی تێدا نیە، بە خوا ئەگـەر نیـاز و نیەتمان یەکلایی بکەینەوە و دڵسۆز بین تیایدا و تێبکۆشین

بۆ گەیشتنی ئەم ئایینە، ئەوە دەگەیشت بە هەموو جیهان، بەڵام ئەرکی بانگەوازکردنمان فەرامۆش کردووە.

وازهێنان لە بانگەواز بۆ لای خوا لە مەترسیدارترینی کارەکانە کە ئەنجامەکەی زەلیلی و سەر شۆڕی و دووریە لە خوای گەورە.

کوا ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ...﴿١١٠﴾﴾(آل عمران)،

واتە: ئێوە باشترینی نەتەوەن نێردرابن بۆ خەڵك، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگریی لە خراپە دەکەن و باوەڕتان بە خوا هێناوە

کوا ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾(فصلت).

واتە: کێ وتەی چاکتر و بەجێترە لەو کەسەی بانگەواز دەکات بۆ لای خواو کاری چاکەدەکات و دەڵێت: بێگومان من لە پیڕی موسڵمانانم.

کوا ((بَلِغُوا عَنِي وَلَو آيَة)) واتە: پەیامەکانی من بگەیێنن با بە ئایەتێکیش بێت.

سبەینێ چی بڵێین بە پەروەردگارمان کاتێ پرسیارمان لێدەکات سەبارەت بە کەمتەرخەمیمان لە بانگەوازکردن بۆ لای خوا؟ بڵێین ماڵ و سامان و کەس و کارمان سەرقاڵی کردین! بڵێین یاریەکانمان سەرقاڵیکردن! بڵێین جگەرەکێشان و نێرگەلە سەرقاڵیکردین! بڵێین یانەکانمان و ژنەکانمان و گەشتەکانمان بۆ خۆشی و رابواردن سەرقاڵیکردین!! چی بڵێن لە کاتێکدا ئازیزانم جیهان چاوەڕێی ئێمەیە بە تایبەتی لەم کاتە ناسکەدا کە جیهانی پیادا تێپەڕ دەبێت.

خوای گەورە من و ئێوەش بگێڕێت لەوانەی شوێن تەعالیمی خوای گەورە دەکەون و خۆشیان دەوێت و شوێن سوننەت و ڕێبازی محمد ﷺ دەکەون و ئەوانەی هەڵدەستن بە ئەرکی بانگەواز بۆ لای خوای گەورە و گەیاندنی پەیامەکەی بە هەموو خەڵکی.. بەراستی خوای گەورە بیسەر و وەڵامدەرەوەیە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ

﴿تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ...﴾ ﴿١١٠﴾ (آل عمران)،

واتە: ئێوە باشترین نەتەوە بوون بۆ خەڵکی هێنرابنە دی فەرمان دەدەن بە چاکە و ڕێگیری دەکەن لە خراپە و باوەر دێنن بە خوا.

قوتابیەك برەو بە مادە هۆشبەرەکان دەدات لە ناو جانتای خوێندندا

ڕێگای مادە بێهۆشکەرەکانی گرتە بەر تاوەکو خەونە گەورەکەی خۆی بێنێتە دی کە ئەویش کڕینی ئۆتۆمبێلێکی وەرزشی گەورە بوو.

نەهامەتیەکە لەوێوە دەستی پێکرد کە زانیاریەکان گەیشتە دەستی ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان کە باس لەوە دەکات یەکێ لە قوتابیەکانە هەڵدەستێ بە برەودانی مادە بێهۆشکەرەکان لە ناو حەرەمی قوتابخانەدا.

ئەفسەرەکە تیمەکەی خۆی ڕاگەیاند چاودێری ماڵی ئەو قوتابیە بکەن، وە هەروەها چاودێری جموجوڵەکانی، وە ئەو کەسانەشی هاتوچۆی دەکەن، و دەڕۆنە ئەو ماڵەوە کە

دەکەوێتە یەکێ لە کەنارەکانەی شاری کوێتەوە، وە لە ئەنجامی چاودێری کردنەکەدا، بۆیان دەرکەوت کە تەنها یەك لاو شك دەبەن کە تەمەنەی لە حەڤە ساڵ تێپەڕ نابێت و هاتوچۆی ماڵەکەی خۆی دەکات و چەند شتێکی سەیری بە دەستەوەیە لە کاتی هاتوچۆکردنەکەدا، پیاوانی لێکۆڵینەوەکان نزیکەی دوو هەفتە چاودێری ماڵەکەیان دەکرد تا دڵنیا بوون لە دروستی چاودێری کردنەکەیان، پاشان مۆڵەتیان لە (النیابة العامة) وەرگرت کە ئەو ماڵە بپشکنن کە لاوەکە نیشتەجێیە تیایدا.. لە کاتی دیاری کراودا پێنج لە پیاوانی لێکۆڵینەوەکانە چوونە ناو ماڵی گومانلێکراوەکەوە، چەند پیاوێکی تریش تەوقی ماڵەکەیاندا و ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان چووە ماڵەکەوە.

دایکی گومانلێکراوەکەی بینی لە گەڵ چەند خوشکێکی بچوکی، لێی پرسین کوا براکەتان؟ لەو کاتەدا خوشکەکانی ڕۆشتن بەرەو ژورەکەی و بانگیان کرد، ئەفسەری لێکۆڵینەوەکانە گوێی لە خوشکەکانیەوە بوو دەیان ووت: پیاوێکی نامۆ (غریب) لە دەرەوەیە و نایناسین

ئیشی بە تۆیە، لاوەکە هات کە حەڤدە سالی تێ نەپەڕاندبوو، نیشانەی شلەژان و ترس لە ڕوخساریدا دیار بوو... لەوە کە لە ئەفسەرەکەی پرسی ئەوە چیە؟ تۆ کێیت؟

ئەفسەری لێکۆڵینەوەکانیش پێی ووت: پێش ئەوەی لێم بپرسیت کە من کێم؟ باڵی ڕاستت بەرز بکرەوە پاشان پێت دەڵێم من کێم؟ لاوەکەش باڵی ڕاستی بەرزکردەوە و ئەفسەری لێکۆڵینەوەکانیش نیشانە و ئاسەواری دەرزی (هیرۆین)ی لە سەر باڵی لاوەکە بینی، لێرەدا ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان لە لاوەکەی پرسی ئێستا دڵنیا بوویت کە من کێم؟ ئیتر لەو کاتەدا تاوانبارەکە هاواری دەکرد لە ئەفسەرەکە و دەپاڕایەوە کە ئەو مەسەلەیە لای دایك و خوشکەکانی باس نەکات و بەڕاستی ئەو بێتاوانە، لێرەدا ئەفسەرەکە فەرمانیدا بە تیمەکە کە ژووری تاوانبارەکە بپشکنن، لە ناو دۆلابی ژوورەکەیدا چەندین لە فافی بێهۆشکەر بە مادەی هیرۆینیان بینی، لە گەڵ ترازوویەکی بچوك و کەوچکێك و چەندین لەفافی تر لە مادەی

حەشیش، ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان لە تاوانبارەکەی پرسی کە چۆن ئەو مادە بێهۆشکەرانەی دەست کەوتووە.

تاوانبارەکە وتی: من هەڵدەستم بە بەرەودان بەو مادە بێهۆشکەرانە بۆ پیاوێکی تر لە بەرامبەر سودێکی مادیدا، هاوکات لە گەڵ کوتانێکی خۆڕایی ئەو مادە بێهۆشکەرانە بۆ خۆم.. ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان پرسیاری لێکرد کە چ کارێك دەکات، وە هەروەها ئەو کڕیارانەی کە ئەم مادەی بێهۆشکەرانەیان دەداتێ.

تاوانبارەکە وتی: لە پۆلی سێ ی ناوەندیدام، و ئەم مادە بێهۆشکەرانە دەفرۆشم بە هاوڕێکانم لە قوتابخانە وە بە هەندێ کەسی تریش کە نایان ناسم.

لاوە تاوانبارەکە دانی نا بەوەدا کە ئاگادری ئەوە نیە کە ئەم کارەی زۆر مەترسیدارە و چارەنووسی خراپی لێ دەکەوێتەوە، وە تاکە خەمیشی ئەوەیە پارەیەکی باشی دەست بکەوێت تا ئۆتۆمبێلێکی وەرزشی پێ بکڕێت، تا کەشخەیی و شانازی پێوە بکات لە نێو هاوڕێکانی قوتابخانەیدا... ئەفسەری لێکۆڵینەوەکان داوای لێکرد کە

ماڵی تاونباری دووەمی نیشان بدات کە بەرەو بە مادە بێهۆشکەرەکانی دەدات، وە مەوعیدێکی بۆ دابنێت بۆ وەرگرتنی کاڵاکەی لە یەکێ لە بنکەکانی کۆمەڵی هەرەوەزی لە ناوچەکەدا.. هەر کە گەیشتە ئەوێ و کاڵاکە بسپێرێت بە لاوە تاونبارەکە، پیاوانی لێکۆڵینەوەکان دەستگیریان کرد و کەلەپچەیان کردە دەستی، ئەو و لاوەکەیان سواری ئۆتۆمبێلەکە کرد،

بەرەو ڕووی بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان و لاوە تاوانبارەکە بوویەوە، تاوانباری دووەم کە بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان بوو دانی نا بە هەموو قسەکانی تاونباری یەکەمدا، بەڵێ بە ڕاستی ئەو ئەم لاوەی بەکارهێنابوو وەك ئامرازێك و هۆکارێك بۆ برەودان بە مادە بێهۆشکەرەکان، وەك چۆن زۆربەی بازرگانەکان لاوان بەکاردەهێنن بۆ برەودان بە مادە بێهۆشکەرەکان، چونکە وەکو پیاوە گەورەکان جێگای شك و گومان نین... وە ڕێك کەوتووە لە گەڵ لاوەکە بۆ برەودان بە مادە بێهۆشکەرەکان لە بەرامبەر بڕێك پارەدا.

وە لەگەڵ دەرزیەکی هیرۆین بە خۆڕایی... لێکۆڵەرەوە دوو تۆمەتی ئاراستەی تاوانباری یەکەم کرد، ئەویش بە دەست خستنی مادەی بێهۆشکەر بە مەبەستی بازرگانی و بەکارهێنانی لە بارودۆخێکدا کە پێچەوانەی یاسایە، دەستی تۆمەتی دووەمیشی ئاراستەی تاوانباری دووەم کرد، ئەویش بە دەست خستنی مادەی بێهۆشکەر بە مەبەستی بازرگانی و بەکارهێنان، وە هەروەها تاوانی قاچاخ چێتی کە ئەو مادانەی باسکران بە دەستی خستبوون بە بێ ئەوەی مۆڵەتی گومرگی پێ بێت و یاسایی بێت... لە سەر ئەو بنەمایە دادگا فەرمانیدا بە بەندکردنی تاونباری یەکەم بۆ ماوەی پێنج ساڵ، و غرامەش بە بڕی دە هەزار دینار، وە بەندکردی تاوانباری دووەم بۆ ماوەی پازدە ساڵ و ئەویش بە غرامە کردنی دە هەزار دینار.

ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەی کە بۆمان باسکردن هاتووە بە سەر لاوێکدا کە حەڤدە ساڵی تێنەپەراندووە، و قوتابیە لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدا و موعتاد بووە بە هیرۆینەوە، ئەویش بە کوتانی باڵی و لە هەمان کاتیشدا بازرگانەی

دەکات بـە مـادە بێهۆشـکەرەکانەوە، وە هەڵدەسـتێت بـە دابەشکردنی بە سەر هەندێ لە هاوڕێکانیدا لە قوتابخانە، مەینەتیەکـە لـەوەدا نیـە کـە ئـەم ڕووداوە بـووە هـۆی وێرانـــــەکردنی ئاینـــــدەی خێزانێـــــك بـــــەڵکو مەینەتیەڕاستەقینەکە لەوەدایە کە خێزانێك لە نـاو ئـەو ڕووداوەدا دروست بوو، خێزانێك هەڵوەشاوە، کە شوێنی ئەم و ئاسایـشی تێدانیـە... و جێگـای سـەقامگیربوونی تێـدا نیە... وە باوکی تێدا نیـە کـە بەڕاسـتی ڕۆڵـی پاسـەوانی دەرگای خێزان دەبینێت ... ڕۆڵـی پێـشەنەگ و نمونەیـەکی بەرز دەبینێـت بـۆ منداڵـەکان... لێـرەدا دەپرسـین... ئـەو خێزانە چۆن دەژین... ئایا باوك دڵنیا نیە لە کوڕەکەی لـە ماڵەوە بێت یان لە قوتابخانە؟ ئایا باوك هاوڕێی کوڕەکانی ناناسێت؟ ئایـا ئاسـەواری دەرزی هیرۆیـن لـە سـەر باڵی کوڕەکەی نابینێ؟ ئایا هەموو ڕۆژێ دادەنیشێت لەگـەڵ ژن و منداڵەکانیدا تاوەکو پێکـەوە نـانی بـەیانی و نیـوەڕۆ و ئێوارە بخۆن... وە ئەگەر گریمان ڕۆڵی باوك لە نـاو خێزانـدا دیار نەبوو... ئەی ڕۆڵی دایك لە کوێیە؟ کـوا چـاودێری و

سەرپەرشتی و سۆز بۆ منداڵەکانی؟ بە ڕاستی ئەمە مەینەتیەکی قورس و گران و ڕاستەقینەیە کە کوڕێکی هەرزەکاری تەمەن حەڤدە ساڵ ببێتە قوربانی... بە ڕاستی ئەمە بەرپرسیارێتی باوکێکی دیار نەبوو و دایکێکی کەمتەرخەمە.

## کۆتایی بێهودەیی

نازانم بۆچی هەر کاتێك ئەم چیرۆکە دەخوێنمەوە کارم تێدەکات کە هێشتا ماوەیەکی زۆرە لە ناو پەڕە رەش و بڵاوەکاندا پارستوومەوە.

ئەم چیرۆکە ماوەیەکە روویداوە کە نزیك نیە، مانای راستەقینە دەدات بەدەستەوە کە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە و باس لە کۆتاییەکی راستەقینە دەکات بۆ چیرۆکێك کە سەیر نیە ئەوە کۆتاییەکەی بێت.

بەڵێ بەڕاستی وتانێکی کاریگەرن، لە هەموو لایەکەوە خەم و پەژارەیی دەورەی داوە، چەندە پڕیەتی لە خەم و ناخۆشی و بەرادەی ئەوەش پەند و ئامۆژگاریە بۆ کۆمەڵێك کە هێشتا پابەند و هۆگرن بە داوێنپاکی راستەقینەوە نەك روپۆش.

چیرۆکەکەی دەگێڕێتەوە ودەڵێت (پێش دوو ساڵ من لە ماڵێکدا نیشتەجێ بووم کە لە تەنیشتیەوە دراوسێیەکمان هەبوو کە کچێك بوو دوای ئەوەی پەیوەندی کەوتە نێوانمانەوە و منیش بەڵێنی هاوسەرگیرم پێدا، لە

ئەنجامدا ئەویش شل بوو.. منیش بە جارێك دڵم راکێشا و شەرەفیم لەکەدار کرد لەیەك رۆژدا، چەند رۆژێکی نەخایاند بۆم دەرکەوت کەسکی بووە، بۆیە دەستەمۆ بوو بۆم، منیش بیرم دەکردەوە.. ئایا بەوەفابم بەرامبەری یان ئەو کێوی سۆزدارییەی بپچڕێنم؟

پاش ماوەیەك لەو ماڵەدا نەما، منیش هیچم نەدەزانی دەربارەی، ساڵانێکی زۆر تێپەڕین بەسەر ئەو رووداوەدا، رۆژێکیان لە گەڵ پۆستەیەکدا نوسراوێکم بۆهات کە ئەمەی تیدا نووسرا بوو {ئەگەر نوسینەکەم بە مەبەستی ئەوە بێت کە پەیمانێ تازە بکەمەوە یان خۆشەویستی کۆن، ئەوە یەك دێرم پێ نەدەنووسی و چونکە پێم وایە پەیمانێك وەك ئەو پەیمانە ناپاکەی تۆو سۆزێك وەك ئەو سۆزە درۆزنەی تۆ، شایەنی ئەوە نیە یادی بکەمەوە و بێتە بۆنەیەك لام یان ئەسەفی بۆ بخوازم و داوای تازەکردنەوەی بکەم، تۆ دەتزانی کاتێك کە دەستبەرداری من بوویت لە ناو سکمدا ئاگرێك هەیە و بڵێسەدارە و کۆرپەیەك پەلەقاژەیەتی و هیچ گوێت بەوە نەدا و راتکرد لە من، تا

ئەو نارەحەتیە نەگریتە ئەستۆی خۆت کەخۆت سازێنەری بوویت و ئەو ئەرکە نەخەیتە سەر شانت کە فرمێسکێك بسریت کە خۆت ناردووتە، ئایا دوای هەموو ئەمانە دەتوانم وێنای ئەوە بکەم کە تۆ پیاوێکی شەریف و بەرێزیت؟!

نەخێر... بەڵکو ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە تۆ ئادەمیزادیت! چونکە هەرچی سیفەتی وەحشیگەری هەیە لە خۆتدا کۆتکردوەتەوە و هەموو ئەمانە تەنها لەبەر ئەوەی تۆ منت کرد بە رێگایەك بۆ رازیکردنی دەروونت، بۆیە تەقەت دا لە دەرگای من و بە رێگای مندا هاتیت، ئەگەر ئەوە نەبوایە لە دەرگای منت نەدەدا و منت نەدەبینی، ناپاکیت لە گەڵدا کردم.. چونکە بەڵێنت پێدام بە هاوسەرگیری و پەیمانەکەت شکاند، رازی نەبوویت ئافرەتێکی داوێن پیس بهێنیت، لە کاتێکدا ئەم تاوانە و ئەم داوێن پیسیە بە هۆی تۆوە بووە، ئەگەر تۆ نەبوویتایە من نەدەبوومە تاوانبار و داوێن پیس، هەوڵەکانت وایان لە

من کرد بڕوات پێبکەم و لەبەردەمتا وەك منداڵێکی بچوك لەبەردەستی زۆردارێکی گەورەدا چۆك دابدەم.

داوێنپاکی منت دزی، بۆیە زەلیل و دڵشکاو بووم، ژیان لەسەرم قورس بوو و هەر لەزەتێك بۆ ئافرەتێك کە نەتوانێ ببێتە ژنی پیاوێك یان بێتە دایکی منداڵێك هیچ تامێکی نییە، بەڵکو نەتوانێت لە کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بژیت تەنها بە سەرشۆڕی و چاوشۆڕی نەبێت لە ترس و تانە و تەشەری خەڵکی.

ئارامیت لێ زەوت کردم، چونکە دوای ئەو رووداوە ناچار بووم لەو کۆشکەدا راکەم کە لە سایەی نازی دایك و باوکمدا بووم، ئەو هەموو رۆزیە بەرفراوانەم بەجێهێشت و ئەو ژیانە خۆشە، بەرەو ماڵێکی بچوك لە گەڕەکێکی دوور کە کەس نەیزانێت و کەس نەدات لە دەرگام تا ژیانی پڕ لە کوێرەوەری تێدا بەرمەسەر.

دایکم و باوکم کوشت، بیستم کە هەردووکیان وەفاتیان کردووە، دڵنیام کە مردنەکەیان بە هۆی خەفەتی من و بێ ئومێد بوون بووە لە بینینی من، تۆ منت کوشت.. چونکە

ئەو ژیانە تاڵەی لە پێکی تۆدا خواردمـەوە و ئـەو خەمـە درێژە کە چارەسەرمکرد بە هۆی تووە گەشتە ئەوپەڕی لـە لەش و دەروونمدا، و کەوتوومەتە ناو جێگای مردنـەوە وەك مریشکێکی پەڕوباڵ سوتاو کە رۆژ بە رۆژ دەپوکێتەوە.

تۆ درۆزن و فێڵباز بوویت، ودزێکی بکوژیت، بڕواناکەم کـە خـوای گـەورە دەسـتبەردارت بێـت و هـەقی منـت لێنەکاتەوە.

من ئەم پەیامـەم بـۆ نەنوسـیویت تـا پـەیمانێك تـازە بکەمەوە یان سۆزێك بنوێنم چونکە تۆ زۆر لەوە سوکتریت، من ئێستا بەرەو گۆڕ هەنگاو دەنێم و لە حاڵەتێکـدام کـە خواحافیزی لە هەموو ژیانم دەکەم بە خێر و شەریەوە و بە خۆشی و ناخۆشیەوە، هیچ ئومێدێکم بە سۆزداری نەماوە و هیچ بوارێك بۆ پەیمان بەستن نەماوە.

من ئەم پەیامەم بـۆ نووسـیت چـونکە راسـپاردەیەکم پێیە بۆت، ئەویش ئەو کچەی خۆتـە، ئەگـەر ئـەویان لـە دڵتا جێگای نەماوە و رۆشتووە ئەوە بەزەیی باوکایەتی بـۆ تۆ جێهیشتووە، وەرەو پێشوازی لێبکە و وەریگرە بۆ خـۆت

تا تووشی نارەحەتی نەبێت وەك چۆن دایکی تووش بـوو }
بە راستی وتانێکی غـەمبار بـوون و کاریگـەریان زیـاترە
کاتێـك کەسـەکە خـۆی بەسـەرهاتەکە بـاس بکـات و
شاردراوەکانی ویژدانی خۆی دەربخات، لەبەر ئەوە زۆر لـەوە
راستگۆترە کە کەسێك بە پێنوسەکەی گوزارشی لێبکات.

ئەم چیرۆکە و هاوشێوەکانی زادەی ئـەو یەکالآبوونەیـە
کە تێیدا دەژین، بەرهەمەکەشی دەرهاویشتنی ئـەو جـۆرە
کێشانەیە کە چارەسەرکردنی کاتێکی درێژی دەوێت.

پیاو هێرش دەکاتە سەر ئافرەت و هەموو شتیٚ ئامـادە
دەکات بۆ ئەو هێرشە لە پەیمانی درۆ و قسەی بریقـەدار و
سیحری و سەرنج راکێش، هەتا فریوی دەدات و لەکـەداری
دەکـات و بـەهادارترین شـتی لـیٚ دەسـتێنێتەوە، پاشـان
دەستی پیسی خۆی پێدا دەسرێت و جیا دەبێتەوە و دەڵێـی
ئیتر هەرگیز یەکتر نابیننەوە .

ئەو ئافرەتە لە سوچێکی ماڵەکەیدا بـە خەفتباریـەوە
دانیشتووە و فرمێسك بە روویدا دێتە خوارەوە و سەری شۆر

کردووەتەوە بۆ سەر شانی، نازانێ بۆ کوێ دەڕوا، و چی دەکات و چۆن دەژی.

داوای ژیان دەکات لە ڕێگای هاوسەرگیریەوە و کەس شك نابات تا شووی پێ بکات، چونکە پیاوەکان پێی دەڵێن داوێن پیس

ئەی بەڕێزان.. پێویستە دڵی ئافرەت بۆهیچ کەسێك نەکرێتەوە پێش ئەوەی بۆ مێردەکەی خۆی بکاتەوە، تاوەکو بتوانێت لە گەڵیدا بژی و هیچ یادگاریەکی کۆن لە گەڵدا هەڵنەگرێت و وێنە و ڕەنگەکانی ناو مێشکی نەشێوێنێت.

زۆر کەم ئافرەت دەتوانێت بە ئەویندارى دەست پێبکات و پاشان دوای ئەوە ژیانێکی خۆش بەرێتە سەر.

ئەو ئافرەتەی کە رقتان لێ دەبێتەوە و سەرزەنشتی دەکەن، گوێ نادەنی کە چی دەکات بە خۆی و بە ویژدانی، بێگومان سبەی دایکی منداڵەکانی ئێوەیە و پایەی ماڵەکانتانە، مەنزڵگای شەرەف و ناموس و پیاوەتی ئێوەیە، تەماشاکەن سبەینێ چۆنن لە گەڵیدا و منداڵەکانتان و خۆتان چۆن دەبێت لەسەر دەستی ئەو.

چۆن ژنـی چـاك دەبیننـەوە بـۆ ئاینـدەی ژیانتـان لـە کاتێکـدا ئێـوە ئـەمڕۆ کـچەکانتان لەکـەدار کـردووە، و منداڵەکانتان لە چ کەش و هەوایەکدا دەژی و بۆنی پـاکی ژیـان هەڵدەمـژێت لـە کاتێکـدا ئێـوە هـەموو و دەوروبەرەکەتان پیس و ژەهراوی کردووە.

لەمڕۆ بـەدواوە بانگەشـەی ئـەوە مەکـەن کـە نـاتوانن هاوسەری باش و بەشەرفتان دەست بکەوێت کە ناموسـتان بپارێزێت و پـارێزەری بەختـەوەری خۆتـان و منداڵـەکانتان بێت، ئەوە تاوانی خۆتانە و بەری ئەو کارەیە کە خۆتان بـە دەستی خۆتان چاندووتانە.

ئەگەر ئێوە رابـردووی ئـەوانتان بپاراسـتایە ئـەوانیش ئێستا و ئایندەی ئێوەیان دەپاراست، بـەڵام ئێـوە ئـەوانتان لەخشتە برد و بە هۆی حەز و ئارەزووەکانتانەوە ئەوانتان لە ناو برد.

ئەی بانگخواز.. ئایا لەمە پەند و ئامۆژگاریتر هەیە

لە یەکێك لە شارەکانی شانشینی سعودیە ئافرەتێك لە گەڵ مێرد و منداڵەکانیـدا لـە یـەکێ لـە گەڕەکەکانـدا

دەژیا، مزگەوتەکە لکابوو بە ماڵەکەیانەوە، بەڵام تووشی بووبوو بە مێردێکی سەرخۆشەوە .

رۆژێك یان دووان تێنەدەپەری دەبووایە لە ژن و کوڕ و کچەکانی خۆی بدایە و دەریبکردنایەتە سەر شەقامەکە و زۆرێك لە خەڵکی گەرەکەکە بەزەییان بە ژنەکە و کوڕ و کچەکاندا دەهاتەوە، دەچوون بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردن و پاشان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان، وە بە تەنها وشەیەکیش سەبووری و یارمەتیان نەدەدا، زۆربەی جار ئەو ئافرەتە هەژارەیان دەبینی کە لە گەڵ کوڕ و کچە بچکۆلەکەیدا لە پاڵ دەرگاکەدا وەستابوون و چاوەڕوانی مێردە سەرخۆشەکەی دەکرد تا دەرگای بۆ بکاتەوە و بیانباتەوە ژوورەوە، دوای ئەوەی هەموویانی دەرکردبوو، ئەگەر دڵنیا بووایە کە خەوتووە کوڕێکی خۆی دەنارده سەر دیوارەکە تا بڕوات و دەرگاکەیان بۆ بکاتەوە و بڕواتەوە ماڵەوە و دەرگا لەسەر مێردە سەرخۆشەکەی دابخات .

هەتا مەستی و سەرخۆشیەکەی بەری دەدات، ژنەکە دەستی دەکرد بە نوێژ کردن و بە گریان و دەپارایەوە لە خوای گەورە رێنمایی مێردەکەی بکات و لێی خۆش بێت.

هیچ کەس لە هامۆشکەرانی مزگەوت نەیان دەتوانی قسە لە گەڵ ئەو پیاوە سەرخۆشەدا بکەن و ئامۆژگاری بکەن، تەنانەت ئیمامی مزگەوتیش، تەنها لەبەر خاتری ئەو ژنە مەینەتبارە و منداڵەکانی، چونکە پیاوێکی سەرخۆش بوو، نکولی لە هیچ خراپەیەك نەدەکرد و هیچ چاکەیەکیشی نەدەزانی، وەکو بە زمانی عەشیارەی دەڵێن (دیبلۆمی هێنابوو لە بەندیخانەدا) یان خۆشەبووبوو تیایدا، چونکە هەر کە بەردەبوو لە بەندیخانە دیسانەوە بەند دەکرایەوە.

ئەو ژنە داماوە دوعای بۆ مێردە سەرخۆشەکەی دەکرد لە سێیەکی کۆتایی شەودا و لە خوا دەپاڕایەوە بە ناوە پیرۆزەکانی و بە خۆشەویسترینی کردارەکانی تا خوای گەورە رێنمایی مێردەکەی بکات بەرەو ئیمان، زۆربەی رۆژەکان دوعای بۆ دەکرد، بەڵام خۆی و منداڵەکانی بەو دەردەوە

دەتلانەوە و کەس نەبوو بەزەیی پێیاندا بێتەوە لەو نارەحەتیە بێجگە لە خوا، نەبرا و نەباوك و نە دایك سۆزیان نەبوو بۆی، لەلای دراوسێکانی و کەس و کاریشی بێزراو بوو بە هۆی هەڵسوکەوتی خراپی مێردەکەیەوە.

جارێکیان ژنەکە کاتێك سەردانی هاوڕێیەکی دەکات لە گەڕەکێکی تری تەنیشتیان و باسی خەم و خەفەتی خۆی بۆ هاوڕێکەی کرد و بۆی باس کرد چەندە ئازار دەچێژێ و مێردەکەی چی دەکات بە خۆی و کوڕ و کچەکانی کاتێك کە سەرخۆش دەبێت... ئافرەتەی هاوڕێی بەدڵ و بەگیان سۆزی خۆی دەربڕی و ووتی: (دڵنیابە و هێمن بەرەوە، من بە مێردەکەم دەڵێم تا سەردانی بکات و ئامۆژگاری بکات.. مێردەکەی گەنجێکی صالحی دانا بوو، حەزی بە خێر و خۆشی دەکرد بۆ هەموو کەسێك، قوئنانی لەبەر دەکرد و فەرمانی بە چاکە دەکرد و قەدەغەی خراپەکاری دەکرد، رازی بوو بە مەرجێ کە پێی نەڵێ کە ئەو ئەو داواکاریەی کردووە تا مێردەکە سەرخۆشەکەی تووڕە نەبێت و لێی نەدات و دەری نەکاتەوە بۆ سەر شەقام

جارێکی تر، بۆیە ژنەکەی تر رازی بوو کە ئەم کارە بە نهێنی بێت لە نێوانیاندا.

مێردی هاورێکەی دوای نوێژی عیشا راستەوخۆ چووە لای مێردەکەی و تەقەی دا لە دەرگا و کابرا بە سەرخۆشیەوە دەرگای لێکردەوە و بینی مرۆڤێکی پۆشتەوە پەرداخە و ریشێکی رەشی درێژی پێوەیە و رووخساری پرپەتی لە نوور و جوانی و تەمەنی نەگەشتووەتە بیست و پێنج ساڵ، پیاوە سەرخۆشەکەش تەمەنی چل ساڵ بوو، لە رووخساریا نیشانەی توورەیی و دوور لە خوایی دەبینرا، تەماشیکرد و پێی وت: تۆ کێیت و چیت دەویت؟

ئەویش پێی ووت: من فلانی کوری فلانم، تۆم خۆش دەوێت و لەبەر خوا هاتووم سەردانت دەکەم.

پیاوەکە قسەکانی تەواو نەکرد ئەم تفێکی کردە رووخساری و لۆمە و سەرزەنشتی کرد و بە زمانێکی سادەو زۆرناخۆش پێی وت: نەفرەتی خوات لێبێت، سەگی پیس ئەمە کاتی ئەوەیە تا سەردانی خەڵکی بکەیت، برۆ

لاچۆ بەڵکو خوا تۆ و ئەو برایەشت نەپارێزێ کە باسی دەکەیت.

بۆنی عارەقی لێدەهات، تەنانەت وای هەست دەکرد کە هەموو گەرەکەکە ئەو بۆنە ناخۆشەی لێوە دێت، تفەکەی سەر روخساری سڕی و پێی ووت: خوا جەزات بداتەوە، پێ دەچێت هەڵەم کردبێت و لە کاتێکی گونجاودا نەهاتم بۆ لات، بەڵام جارێکی تر دێمەوە بۆ سەردانت پشت بە خوای گەورە.

پیاوە سەرخۆشەکە وەڵامی دایەوە: من نامەوێت جارێکی تر روخسارت ببینم، ئەگەر بێیتەوە سەرت ئەشکێنم، بۆیە دەرگاکەی داخست بە رووخساری ئەو لاوە ساڵحەدا، لاوەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و وتی سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە وای لێکردم لە پێناوی خوا و لە پێناوی ئاینەکەیدا تفم تێبکرێت و سەرزەنشت بکرێم، وا هەست دەکەم دنیا هەمووی بەروویدا دەکرێتەوە ئەگەر ئەو خێزانە لەو تیاچوونە رزگار بکەم، بۆیە دەستی کرد بە دووعا کردن بۆی لە ساتەکانی دوعاکردن و لە کاتی

وەڵامدانەوەدا و داوای لە خوای گەورە کـرد کـە یارەمـەتی بدات بۆ رزگارکردنی ئەو خێزانـە لـە مەینەتیـەکانی بـۆ هەتاهەتایی، خـەم و پـەژارە دڵـی گوشـی بـوو، هـەموو خەمێکی ئەوە بوو رۆژێـك بێـت و ئـەو پیـاوە سەرخۆشـە ببینێت رێنمایی کراوە.

بۆیە هەوڵیدا چەند جارێك سەردانی بکات و لە چـەند کاتێکی جیاوازدا بـەڵام، وەکـو جـاری یەکـەم دەسـت نـرا بەروویەوە تا جارێکیـان بڕیاریـدا کـە لـە پـاڵ ماڵیانـدا نەجولێت تا قسە نەکات لە گەڵیدا.. رۆژێکیان تەقـەی دا لە دەرگا، پیاوە سەرخۆشەکە هات بـە دەمیـەوە و دەسـتی کرد بە غەڵبەغەڵب و وتی: ئایـا مـن چـەند جـارێ تـۆم دەرنـەکرد، بۆچـی هـەر دێیتـەوە لـە کاتێکـدا مـن دەرم کردیت؟!!!.

پێی وت: ئەمە ڕاستە بەڵام لەبەر خـوای گـەورە تـۆم خۆش دەوێت و دەمەوێت بۆ چەند ساتێك دانیشم لە گەڵتا و خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەیەوە فەرمویەتی: (ئـەوەی لەبـەر خـوای گـەورە سـەردانی برایـەکی بکـات

بانگخوازێ لـە ئاسمانـەوە بـانگی دەکـات تـۆ پیرۆزیـت و ڕۆشتنەکەشت پیرۆزە و جێگایەکت لەبەهـشتدا بـۆ خـۆت دیاری کردووە).

پیاوە سەرخۆشـەکە لەبـەردەم زۆرلێکردنـی ئـەو لاوەدا تەریق بوویەوە، هەرچەندە ئەم خراپیش بوو لە گەڵیدا بۆیە پێی وت: بەڵام من ئێستا عـارەق دەخۆمـەوە و تـۆش لـە روخساردا دیارە کە چاکەخوازی و لە خوا ترسیت و نـاتوانم رێگات بدەم کە سەرمێزەکەی من ببینیت کە رازاوەتەوە بە مەشروبات.. بە هۆی رێزمەوە بۆ تۆ.

لاوەکە وتـی: بمبـەرە ئـەو شـوێنەی کـە عـارەقی تێـدا دەخۆیتەوە و با پێکەوە قسە بکەین و تۆش عارەقی خـۆت بخـۆرەوە، مـن نـەهاتووم تـا رێگـای عـارەق خواردنـەوەت لێبگرم، بەڵکو تەنیا هاتووم سەردانت بکەم.

سەرخۆشەکە وتی: ئەگەر کارەکـە بـەو شـێوەیە بێـت فـەرموو وەرە ژوورەوە، بـۆ یەکـەم جـار لاوەکـە رۆشـتە ماڵیانـەوە، دوای ئـەوەی دەرکـی بـە دوو شـت کـرد لـە

پێشوازی نەکردنی و دەرکردنیدا و دڵنیـا بـوو کـە خـوای گەورە کارێکی دەوێت لەم پیاوەدا.

بردیە ئەو ژوورەی کە عارەقی تێـدا دەخـواردەوە، باسـی مـەزنی خوای گەورەی بۆ کرد و باسی ئەو ناز و نیعمەتـەی خوای گەورە کە لە بەهەشتا دایناوە بـۆ بـاوەڕداران و ئـەو ئاگر و سزایەی دایناوە بۆ بێبـاوەڕان لـە رۆژی دواییـدا و باسی تەوبەی بۆکرد و خوای گـەورە بەنـدە تۆبـەکارەکانی خۆش دەوێت ئەگەر داوای رێنمایی بکـەن.. پاشـان باسـی خێر و پاداشتی سەردانی بۆکرد و خـوای گـەورە دڵخـۆش دەبێت بە تەوبەی بەندەی تەوبەکار و ئەگەر بەندەی صـاڵح داوا لـە خـوای گـەورە بکـات خـوای گـەورە یـەك جـار دەفەرمویت (لَبَيْكَ عَبْـدِي)وە ئەگـەر بەنـدەی تاوانبـار و سەرپێچیکەر بپارێتـەوە لـە خـوای گـەورە خـوای گـەورە دەفەرمویت (لَبَيْكَ لَبَيْكَ لَبَيْكَ عَبْدِي) سێ جار.

تەماشایکرد روخساری پیاوە سەرخۆشەکە دەگەشێتەوە کـە بـە هـەموو ئەندامـەکانی گـوێی گرتبـوو، وە هـیچ باسێکی عەرەق حەرام بوونی بۆ نەکرد لە کاتێکیشدا کـە

دەیزانی لە گوناهە گەورەکانە، پاش ئەوە هاتە دەر بێ ئەوەی یەك وشە باسی عارەقی بۆ بکات.

بۆیە داوای مۆڵەتی لێکرد و خواحافیزی لێکرد و داوای لێکرد ڕێگای بدات جارناجارێك سەردانی بکات، ئەویش ڕەزامەندی نواند.

پاش چەند ڕۆژێك هاتەوە بۆ لای، بینی سەرخۆش و مەستە، تەنها بە تەقەدان لە دەرگاکە پێشوازی لێکرد و بردی بۆ ئەو شوێنەی کە عارەقی تێدا دەخواردەوە، لاوەکە باسی بەهەشتی بۆ کرد و ئەو پاداشتەی کە دانراوە بۆ تەوبەکاران و پەشیمانەکان.

تەماشای کرد پیاوە سەرخۆشەکە خەریکە عارەق خواردنەکەی کەم دەکاتەوە لە کاتی قسەکردنی ئەمدا و وای هەست دەکرد کە خەریکە نزیك دەبێتەوە لێی، بۆیە دەستی کرد بە شکاندنی پەرداخەکان لە دڵیدا و وردە وردە بەردەوام نەبوونی لە خواردنەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو قسانەی ئاراستەی دەکرێت وەریدەگرێت، بۆیە لاوەکە لە گیرفانیدا بۆنێکی گرانبەهای دەرهێناو پێشکەشی کرد

و بە خێرایی هاتە دەرەوە و دڵخۆش بوو بەو دەستکەوتەی لەم سەردانەیدا دەستی کەوتبوو، هەستی بە پێشکەوتنێکی باش دەکرد.

دوای چەند رۆژێکی تر گەڕایەوە بۆ لای پیاوەکە، بینی لە حاڵەتێکی زۆر جیاوازدایە بە تەواوی، هەرچەندە سەرخۆش بوو کاتێك لاوەکە باسی بەهەشت و رۆژیەکانی بۆ دەکرد پیاوە سەرخۆشەکە وەکو منداڵێکی بچووك دەستی کرد بە گریان و وتی هەرگیز خوای گەورە لە من خۆش نابێت، هەرگیز خوای گەورە لە من خۆش نابێت، چونکە من رقم لە پیاوچاکان و پیاوانی ئایینی و رقم لە راستە رێگا و رقم لە هەموو کەسێکە و رقم لە خۆمە و من ئاژەڵێکی سەرخۆشم و خوای گەورە ئاورم لێناداتەوە و تەوبەی من قبوڵ ناکات، با تەوبەش بکەم ئەگەر خوای گەورە منی خۆش بویستایە وای لێنەدەکردم عارەق بخۆمەوە و منی بەم شێوە لێنەدەکرد، بەم خراپەکاری و تاوانبارییەوە کە ساڵانێکی درێژە بەم شێوە دەژیم.

لاوە صاڵحەکە لە ئامێزی گرت و پێی وت: بێگومان تەوبەکەت وەردەگیرێ، چونکە تۆبەکار لە گوناه وەك ئەو کەسە وایە کە گوناهی نەکردبێت وە بەراستی دەرگای تەوبە کراوەیە کەس لە نێوانی تۆ و خوای گەورەدا نیە، بەراستی هەرچی بەختەوەری هەیە لەم ئاینەدایە، و کەسی گەڕاوە بۆ لای خوا زۆر جوانترە ئەگەر داوای ڕێنمایی لە خوای گەورە بکات بە دڵێکی پاکەوە، تەنها ئەوەندەی لەسەرە کە بە دڵسۆزیەوە داوای ڕێنمایی بکات لە خوای گەورە، خوای گەورەش لێت وەردەگرێت و بەهای ئەو تەوبەکردنە لای خوای گەورە زۆر مەزنە..لاوەکە پێی وت کە ئێستا نیازی وایە گەشتێك بکات لە گەڵ کۆمەڵێ هاوڕێیدا بۆ مەککەی پیرۆز.. پێشنیاری بۆ کرد لە گەڵیاندا بێت، پیاوە سەرخۆشەکەش بە دڵێکی شکاوەوە وتی: من سەرخۆشم وە برا ئایینیەکانت لێم قبوڵناکەن من هاورێیەتیان بکەم.

گەنجەکە وتی: هەقت نەبێت ئەوان وەکو من وان، تۆیان خۆش دەوێت و ئاساییە بە لایانەوە ئەگەر بەو شێوەیەش

هاوڕێیـــەتیان بکـــەیت، کـــاری ئێمـــە ئەوەیـــە بـــڕۆین بـــۆ مەککـــەی پـــیرۆز بـــۆ عـــەمرە، کـــە تـــەواویش بـــووین لەبەجێهێنانی عەمرە جارێکی تر ئەگەڕێینەوە بۆ شـاری خۆمـان، لە میـانی گەشتەکەماندا دڵخۆش دەبـین کـە تـۆ لەگەڵماندا بیت.

سەرخۆشەکە وتی: ئایا ڕێگام پێـدەدەن کـە پێکەکـەم لەگەڵ خۆمدا بهێنم، چونکە من بـۆ یـەك سـات نـاتوانم دەستبەرداری ببم.

لاوە صاڵحەکە بەوپەڕی دڵخۆشـیەوە وتـی: ئەگـەر زۆر ناچاریت بیهێنە لەگەڵ خۆت، تێڕوانینی ئـەو لاوە زۆر زۆر دووربینانە بوو، هەرچەندە هەڵگرتنی شوشەی عـارەق لـە ئۆتۆمبیلەکەیـدا زۆر مەرسـیدارە و پاشـان سەرخۆشـێك لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت و لە هەمان کاتیـشدا سـەرخۆش بێت، ڕێگای مەککە پڕیەتی لە دەوریـەی پـۆلیس، بـەڵام بڕیاری موجازەفەکردنی دابوو لە پێنـاو ڕزگـارکردنی ئـەو ئافرەتە و منداڵەکانی.. ئەوەی هەوڵ بدات بـۆ ئامـانجێکی گەورە شتە بچووکەکان ئاسان دەبێت لایەوە.

لاوەکە پێی ووت: ئێستە هەستە و غوسڵ دەربکە و دەست نوێژ بگرە و ئیحرام بپۆشە.. خۆی رۆشت بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەی و پۆشاکی تایبەتی ئیحرامی خۆی پێدا تا دوایی بۆ خۆی بکڕێت و پاشان بردیەوە هەتا بەردەم ماڵی خۆیان.. کاتێك کە سەر سمی دەدا و بە ژنەکەی وت: من لە گەڵ کۆمەڵێ برادەری ئیماندار دەڕۆم بۆ مەککە بۆ عەمرە، ژنەکەی لە خۆشیدا خەریك بوو باڵەفڕ دەبوو.. جانتاکەی ئامادەکرد و رۆشت بۆ گەرماو تا خۆی بشوات و بە پۆشاکی ئیحرامەوە هاتە دەرەوە.. هەرچەندە هێشتا هەر سەرخۆش بوو، لاوە صالحە پاڵەوانەکە پەلەی لێدەکرد هەتا پەشیمان نەبێتەوە لە قسەکانی و نەڕوات لە گەڵیاندا و بڕوای نەدەکرد ئەم فرسەتە مەزنە دێتە پێشەوە بۆی، تا چەند رۆژێ دووری بخاتەوە لە مەست بوون و هاوڕێی خراپ، چونکە ئەگەر هۆشی بێتەوە لەوانەیە نەڕوات لە گەڵیاندا و شەیتان لە چەندین دەرگاوە بڕواتە ناخیەوە و نەهێڵێت هاوڕێیەتیان بکات.. کاتێ بردیە دەرەوە و ناردی بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکەی و بە خێرایی رۆشت هەتا

گەشتە لای هاوڕێ صالحەکانی کە ئاینداری و تەقوا لە روخسارياندا دياربوو، وە بیبات بۆ مالەکانیان و ببێتە هاوڕێیان لەم گەشتە مێژوویەدا.

ئۆتۆمبیلەکە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، لاوە سالحەکە ئۆتۆمبیلەکەی لێدەخوری و لە پالّ پیاوە سەرخۆشەکەدا و دوو هاوڕێکەشی لە دوواوە دانیشتبوون کە چووبوون بۆ لایان و هەلّیگرتبوون لە گەلّ خۆیدا... بە درێژایی ڕێگاکە سوورەتە کورتەکانیان دەخوێند لەگەلّ هەندێ لە فەرموودە صەحیحەکانی بوخاری، هەموویان سەبارەت بە تەوبەکردن و هاندان و ترساندن بوون کە لەوەی لە لایەن خواوەیە لە خێری نەبڕاوەو فەزلّی کارەکان.

پیاوە سەرخۆشەکە نەیدەزانی سورەتی فاتیحە بخوێنێت و تێکەلّی دەکرد و بە ناتەواوی دەیخوێند، کاتێ سەرەی ئەم دەهات.. پێش ئەوەی ئەم بخوێنێت سێ جار ئەوان دەیان خوێندەوە هەتا ئەو هەلّانەی بۆ ڕاست بکەنەوە کە تێیدەکەوێت بە بێ ئەوەی پێی بلّێن تۆ هەلّەتکرد، چونکە ناگونجێ کەسێك لە سوورەتی فاتیحەدا هەلّە بکات بەو

شێوەیە.. هەتا چەندین جار سوورەتە کورتەکانیان دەخوێندەوە و چەندین جار فەرموودە جیاوازەکانیان سەبارەت بە فەزڵی کردەوەکان دەخوێندەوە،ئەویش گوێی دەگرت و نقەی لێوە نەدەهات.. پێش ئەوەی بگەنە شاری مەککە، هەرسێ هاوڕێکە بڕیاریاندا کە نەچنە ناو مەککەوە تا بە تەواوی هاوڕێکەیان مەستیی نامێنێت و سەرخۆشیەکەی بەری دەدات، بۆیە بڕیارياندا لە یەکێ لە جێگاکانی حەوانەوەی سەر ڕێگاکە لابدەن، بە بەڵگەی ئەوەی کە ماندووبوون و دەیانەوێت بخەون، هەتا بەیانی، پاشان دەست بکەنەوە بە گەشتەکەیان، وە ئەمیش زۆری لێدەکردن کە دەتوانێت ئۆتۆمبیلەکەیان لێبخوڕێت و ئەوانیش با بۆ خۆیان بخەون، چونکە ئەو هەرگیز خەو نەی دەبردەوە.

ئەوانیش وتیان خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، ئێمە دەمانەوێت لە هاوڕێیەتی تۆ لەزەت وەربگین و زۆرترین کات لە گەڵ یەکتردا بەرینە سەر، بۆیە ئەویش رازی بوو، رۆشتن بۆ جێگایەکی حەوانەوە کە لەسەر رێگاکەدا بوو،

بۆیە جێگای هاوریێ سەرخۆشەکەیان لە نێوان خۆیاندا داخست تاوەکو ئەمان ببینێت کە چی دەکەن، ئەوان دەستیان کرد بە باسکردنی ئادابەکانی خەوتن و چۆن بخەون و بە پێی سوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ بێت، ئەمیش تەماشای دەکردن و لاسایی دەکردنەوە، چەند خولەکێکی نەخایاند پیاوە سەرخۆشەکە کەوتە ناو خەوێکی قووڵەوە.

سیانەکە پێش بانگی بەیانی خەبەریان بوویەوە و لەو کۆتایی نیوەشەوەدا دەستیانکرد بە نوێژ و دووعا و پاڕانەوە بۆ هاوڕێکەیان کە بە هۆی کاریگەری کحولەوە لە خەوێکی قوڵدا بوو... سوجدەیان دەبرد و دەگریان تا خوای گەورە رێنمایی بکات بە جوانترین شێوە و بگەڕێتەوە سەر ئایینەکەی، کاتێ ئەم خەوتبوو، خەبەری بوویەوە ئەوانی بینی پێش بانگی بەیانی نوێژ دەکەن و دەگرین و دەپاڕێنەوە لە خوای پەروەردگار.. کەمێك ترس چووە ناو دڵیەوە، بەرە بەرە خەریك بوو مەستیەکەی بەریدەدا، لە ژێر نوێنەکەیەوە چاودێری کردەوەی ئەو لاوانەی دەکرد بەو نیوەشەوە، وە بە نوێنەکەی خۆی و خەمە گەورەکەی

شاردبوویەوە، زۆر شەرمی لەوان و لە خوای گەورە دەکرد، لە خۆی پرسی چۆن لە گەڵ کەسانێکی ئەوا صالّحدا بڕۆم کە شەوانە هەڵدەستن و لە ترسی خوا دەگرین و دەخوێنن و دەخۆنەوە بە پێی سوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ، منیش ئاوا سەرخۆشم، بۆیە پرسیار گەلێکی زۆری بە مێشکدا هات، تا وای لێهات نەیدەتوانی بخەوێتەوە، دوای چەند ساتێك بانگی بەیانی درا و ئەوانیش وەك هاوڕێکەیان شەو خەوتبن چەند ساتێکی نەخایاند هەستانەوە بۆ نوێژی بەیانی و نەیاندەزانی هاوڕێکەیان لە ژێر جێگاوە چاودێریان دەکات، بۆیە ئەویش هەستایەوە و دەستنوێژی گرت و لە گەڵیان رۆشت بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد.

رواڵەتی لە جاران زۆر باشتربوو، بەشێوەیەك نیشانەکانی سەرخۆشی بەتەواوی لەسەریدا نەمابوون، بۆیە نوێژی بەیانی ئەنجامدا لەگەڵیاندا و لەگەڵ هاوڕێکانی کە خۆشی دەویستن، بە هۆی ئاکارە جوانەکانیانەوە و پابەند بوون بە ئایینەکەیانەوە و رێزگرتن لە ئەم و مامەڵەیان لە

گەڵیدا بە شێوەیەك کە پێشتر شتی وای نەبینیووە و گەڕایەوە بۆ شوێنی حەوانەوەکەی.

دوای ئەوەی نانی بەیانیان ئامادەکرد ئەوان هەستان بە خزمەتکردنی و وەك ئەوەی ئەمیر بێت و ئەوانیش خزمەتی بکەن و ڕێزی بگرن و بەسۆزبن لەگەڵیدا و بەراوردی دەکردن لە گەڵ دراوسێیانەی کە دەیوت رقی لێیانە، تەواو سەرسام بوو پێیان... بۆیە ئەوان لەگەڵ یەکتردا باسی ئادابەکانی خواردنیان دەکرد و خواردنیش لەبەردەستیاندا بوو، ئەویش گوێی لەو قسانە بوو.. خواردنیان خوارد و دانیشتن هەتا خۆر هەڵهات و هەستان و نوێژی چێشتەنگاویان کرد و جارێکی تر ڕۆشتنەوە خەوتن تا کاتژمێر دەی بەیانی تا دڵنیابن هاوڕێکەیان بە تەواوی مەستیەکەی نەماوە و چووەتە دۆخی سروشتی خۆی، بۆیە هاوڕێکەی بانگ کرد و کەمێك قسەیان کرد: چۆن منت هێنا بەم سەرخۆشیە لە گەڵ ئەم پیاوە چاکە بەرێزانەدا، خوا جەزات بداتەوە، پاشان من شوشە عارەقەکەم لە سەیارەکەمدا بینی، کێ هێنابووی، لاوە صالحەکەش پێ

وت من هێنام!! دوای ئەوەی کە تۆم بینی سووریت لەسەر هێنانی و بە شوشە عارەقەکەوە نەبێت نایەیت لە گەڵمان، ئەویش وتی: ئایا هاوڕێکانت بینیان، وتی: نەو، ئەوان نەیان بینی، چونکە لە کیسێکی رەشدایە و بە هیچ شێوەیەك دیار نیە بۆیە وتی: سوپاس بۆ خوا نەیان بینیووە.

دوای ئەوە کەوتنە رێ بەرەو مەککە و هاوڕێکەیان لە گەڵدا بوو لە سەرەتای گەشتەکەیاندا چیان کرد ئەنجامیان دایەوە، چەند سورەتێکی کورتیان خوێندنەوە و لەگەڵ چەند فەرموودە و پەند و ئامۆژگاری لە کاتی گەشتەکەیاندا، بەڵام ئەم جارەیان هاورێکەیان هەوڵدەدات کورتە سورەتەکان بە شێوەیەکی باشتر لە پێشووتر بخوێنێتەوە، لە میانی رێگاکەیاندا شتی زۆریان خوێندەوە، پاشان گەشتنە مەککە و رۆشتن بۆ (بیت الحرام)و رێزیان دەگرت لە هاورێ سەرخۆشەکەیان و کە هەندێ جار زیادەڕۆییان دەکرد لە رێزگرتنیدا بە ئومێدی رێنمایکردن... تەوافیان کرد و رۆشتن بۆ (السعی)و لە

ئاوی زەمزەمیان خواردەوە و ئەویش مۆڵەتی لێوەرگرتن بڕوات بۆ (الملتزم).. ئەوانیش مۆڵەتیاندا و ئەویش ڕۆشت و دەستی گرت بە (الملتزم)ـەوە بە کوڵ دەستی کرد بە گریان... لاوە صاڵحەکە کە لە گەڵیدا و لە تەنیشتیەوە بوو، وای هەست دەکرد کە پایەکانی کەعبە بە هۆی گریان و لاواندنەوەی ئەمەوە دەلەرزن فرمێسکەکانی دەبارینە سەر گۆڕەپانی دەوری کەعبە.

لاوە صاڵحەکەش بە هۆی گریانی ئەوەوە ئۆقرەی لێبڕا و بە کوڵ گریا، گوێی لە دوعا و پارانەوەکانی بوو، بە ڕاستی دیمەنێکی خەمناك بوو، کە دیمەنێك بەو شێوەیە ببینێت، داوای لە خوای گەورە دەکرد کە تەوبەکەی قبوڵ بکات و پەیمانی دەدا بە خوای گەورە کە جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر عارەق خواردنەوە و دامەزراوی بکات و لە دوعاکردنەکانیدا ئەوەندەی دەزانی بڵێت: پەروەردگارا ڕەحم پێبکە، خوایە گیان زیادەڕۆیی زۆرم کرد، دەی ڕەحم پێبکە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، ئەگەر لە ڕەحمەتی خۆت دەرم بکەیت ئیتر پەنا بۆ کوێ بەرم، ئەگەر لێم خۆش

نەبیت بێجگە لە تۆ کێ رەحمم پێدەکات.. پەروەردگارا، بەڕاستی دەرگاکانی بەزەیی و رەحمی تۆ کراوەیە، منیش تکا دەکەم و لێت دەپاڕێمەوە خوایە گیان بێ ئومێدم مەکە.

دوعاکەی زۆر کاریگەر بوو تا ئەو رادەیەی هەموو ئەوانەی هێنایە گریان کە بە دەوریەوە بوون، گریانەکەی زۆر بە سوێ بوو، وات هەست دەکرد کاتێ تکا دەکات لە پەروەردگار گیانی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان، هەر دەگریا و داوای فریاکەوتنی دەکرد تا ئەو رادەیەی هاوڕێکەی وا گومانی دەبرد کە دڵی خەریکە پەرت دەبێت... بەردەوام بوو لەسەر ئەو شێوازە و بۆ زیاتر لە سەعاتێك دەپارایەوە لە خوای گەورە و هاوڕێکەشی لەدوایەوە لەگەڵیدا دەگریا... بەراستی دیمەنێکی کاریگەر بوو، بە تایبەتی دیمەنی بەکوڵ گریانی پیاوێك چل ساڵی تەمەنی تێپەڕاندبێت و دەستی بە دیواری کەعبەوە بێت، ئەو شتەی زیاتر مرۆڤی دەهێنایە گریان ئەوەبوو کە دەیووت: خوایە گیان کاتێك مەس و سەرخۆش دەبووم لە ژنەکەمم

دەدا و دەرم دەکرد ، دەی خوایە گیان لەو کردەوانەم خۆشبە بەرامبەر بە ئەو،خوایە گیان رەحم و بەزەی تۆ هەموو شتێکی گرتووەتەوە و داوات لێدەکەم خوایە گیان کە رەحمەت و بەزەیت منیش بگرێتەوە...

خوایە گیان من لەبەردەمی تۆدا راوەستاوم و نائومێدم مەکە، خوایە گیان ئەگەر رەحمم پێ نەکەیت، بێجگە لە تۆ کێ رەحم بە من دەکات، خوایە گیان من تەوبەم کردووە، دەی لێیم وەرگە و پێیم بفەرموو ئەی پەروەردگار(لبیك لبیك لبیك عبدی) خوایە گیان من داوات لێدەکەم روو لە من وەرنەچەرخێنی، خوایە گیان تەماشامکە ئەوەتا زەویم پڕکردووە لە فرمێسك، خوایە گیان من لەبەر دەستی تۆدام و میوانی تۆم لە ماڵەکەتدا، وەکو مامەڵەی مرۆڤەکان مامەڵەم لەگەڵدا مەکە.

خوایە گیان ئەگەر داوایان لێبکەم رێگریم دەکەن و ئەگەریش تکایان لێبکەم بە سووك تەماشام دەکەن، خوایە گیان سینەم فراوان بکە و بینایم رووناك بکەرەوە و خوایە گیان با رووناکیت بمگرێتەوە و خۆشەویستی عەرەقم

لا ببوغزێنە تا زیندووم لە ژیاندا.. پەروەردگارا تووڕە مەبە لێم و رقت لێم نەبێت، ئای چەندە تۆم تووڕە کرد بە گوناە و تاوانەکانم کە ناژمێردرین، کاتێ کە سەرپێچی تۆم دەکرد و تۆش تەماشات دەکردم.

هاوڕێکەی لەم کاتەدا داوای لێکرد دوعای بۆ بکات.. بۆیە گریانەکەی زیادی کرد و دەیووت پەروەردگارا ئایا داوای دوعا لە کەسێکی وەك من دەکات!!؟.

خوایە گیان من ماوەی بیست و پێنج ساڵە سەرپێچی تۆ دەکەم و دەستبەرداری من نەبویت، مەهێڵە لە گوناهەکانمدا بگەوزێم، خوایە گیان من فاسق و خراپەکارم و لەبەردەم دەرگاکەتدا وەستاووم و بمگێڕە بە پیاوچاکەکانی خۆت، خوایە گیان من داوای رێنمایت لێدەکەم و ئەوەی نزیکم دەکاتەوە لە تۆ لە گوفتار و کردار، وە من ملکەچم و زەلیلم لە نێو دەستی تۆدا و شکاومەتەوە، پەروەردگارا بەڕاستی گوناهەکانم زەوی و ئاسمانەکانی پرکردووە، ئەی بە بەزەییترینی بەزەییان لە هەموو گوناهەکانم خۆشبە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی...

هەردەگریا و دەلالآیەوەو هەندێ جاریش گریان زاڵ دەبوو بەسەریدا و تەنها گوێت لە گریانەوە دەبوو... بانگبێژ بانگی عەسریدا و دانیشتن بۆ نوێژ کردن، پیاوە سەرخۆشە تۆبەکارەکەش هێشتا خۆی هەڵواسیبوو بە دیواری کەعبەداو دەگریا هەتا هاورێکەی بەزەیی پێدا هاتەوە و بردی بۆ ریزی نوێژگەران تا نوێژ بکات و بحەوێتەوە لە گریان... لە گەڵ خۆیا بردی و باوەشی پیادا کردبوو وەك دایکی یان وەك باوکی... دوو رکات نوێژی کرد پێش نوێژی عەسر، نوێژەکەی هەمووی گریان بوو بە دەنگێکی هێواش کە دڵی دەپچراند و سوێی لە دڵی دەوروبەری دەهینا.

بەراستی دوعای ژنەکەی لە شەودا خوا وەریگرت و دوعای لاوە صالحەکە بەسوود وبەرهەمداربوو... دوعای هاورێکانی لەشەودا بۆی لەسەفەرەکەیاندا مەبەستی خویی پێکا، بەراستی دووعا و پاڕانەوە لە میانی شەو و رۆژێکدا مرۆڤێکی تری سازاند، ئەوەتا هاورێکەیان کاتێ هەست بە شیرنی ئیمان دەکات، لە ترسی خوای گەورە

دەلەرزێت، بەراستی دوعاکردن بە پەنهانی ئەنجامی خۆی پێکا و ڕێنمایی نیشاندا... هاوڕێکانی لەو گەشتەیاندا بەزەییان پیادا دەهاتەوە بە هۆی گریانیەوە.. نوێژ تەواو بوو، هاتنە دەرەوە بە دوای ئوتێلێکدا دەگەڕان کە نزیکی حەرەم بێت، هێشتا فرمێسك بە ڕووخساریەوە بوو، یەکێکیان کە هەموو قورئانی لەبەر بوو کە زۆر پارێزکار(المتواضع) بوو تا ئەو ڕادەیەی هەردەم دەم بە خەندە دەتبینی، کاتێ تەوبەی هاوڕێکەی بینی زیاتر ڕێزی لێدەگرت و زیادەڕۆیی دەکرد لە ڕێزگرتنیدا و سوور بوو لەسەر ئەوەی پێلاوی ئەو تەوبەکارە هەلگرێ و لە بەردەرگای حەرەمدا بیخاتە ژێر خۆی ئەم هەڵوێستەی ئەو حافیزەی قورئانە شتانێکی لە دڵی ئەمدا شکۆفە پێکرد کە کەس نازانێ بێجگە لە خوا و بەڵکو خەیاڵیش دەستەوسانە لە وەسفکردنی.. بەڵێ پێلاوەکانی خۆی و ئەوی هەڵگرت و تا دەرەوەی حەرەم بردنی و کردنیە پێ و بەو کردەوەی خۆی زۆر دڵخۆش بوو، چوونە ئوتێلەکەوە کە دەیڕوانی بەسەر حەرەمدا، پێنج ڕۆژ لەوێ مانەوە،

هاوڕێکەیان بۆ هەموو نوێژێ دەچوو بۆ مزگەوت و دەستی دەگرت بە (الملتزم)ـەوە و دەگریا و ئەوانەی دەورووبەری خۆی دەهێنایە گریان، شەوانیش هەڵدەستا بۆ عیبادەت و خواپەرەستی و دەگریا و هاوڕێکانی و دیوارەکانیش لە گەڵیدا دەگریان.. نەت دەبینی هەرگیز بخەوێت، بە رۆژ لە بەردەم دەگریا و شەویشی زیندوو دەکردەوە بە نوێژکردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە.

دوای ئەوەی گەشتەکەیان تەواو بوو، گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان، کاتێ لە ڕێگادا بوون داوای لە هاوڕێکەی کرد کەمێك ئۆتۆمبیلەکە راوەستێنێت، ئەویش بە هۆی داواکاریەکەیەوە وەستاندی و تۆبەکارەکەش شوشە عارەقەکەی لە کیسە رەشەکەی بەردەم هاوڕێکەیدا دەرهێنا و هەمووی رژاند و پێی وتن: تو خوا لە رۆژی حەشەر و زیندووبوونەوەدا شایەتیم بۆ بدەن کە من جارێکی تر ناگەڕێمەوە سەر ئەم کارە.

کاتێك کە دەیڕژاند دەگریا بۆ ئەو گوناهانەی کە کردبوونی بە هۆی ئەو عارەقە نەفرەتیەوە، چاوی

هاورێکانیشی پڕبوو بوون لە فرمێسك و وشانێك لە چاوانیانەوە گوزارەشتی دەکرد کە نەیاندەتوانی چۆن بە زمان دەری ببڕن، چونکە بەڕاستی ئەسرین و فرمێسك کاریگەرترە تا وتەی سەرزار، بۆیە دەستیان کرد بە گریان، دوای ئەوە کەوتنە رێ و ئەوانیش وەك ئەو دەگریان .. بێدەنگی تێکەڵی لاواندنەوە بووبوو، گریانەکان تێکەڵی یەکتری دەبوون، پێش ئەوەی بگەنە شارەکیان، پێیان وت: ئێستا دەڕۆیتەوە بۆماڵی خۆتان و رووگەش و بەسۆز و میهرەبان بە لەگەڵیاندا، و ئامۆژگاریان کرد سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لە گەڵ ژن و ماڵ و منداڵدا.. دوای ئەوەی خوای گەورە رێنمایی کردیت و هەمیشە پابەند بێت بە نوێژی جەماعەتەوە لە مزگەوتا و خۆی فێری کاروباری ئایینی بکات لە زانا خواناسەکانەوە، چونکە خوای گەورە تۆبەی تۆبەکار وەردەگرێت و دڵخۆشە پێی، بەڵام بەردەوام بوون لەسەر رێنمایی و تەوبەکردن لە باشی رەحمەت و هیدایەتە، ئەویش دەیووت بە خوا ئیتر

هەرگیز سەرپێچی خوای گەورە ناکەم و ئەوانیش دەیانووت (إنشاءالله) فرمێسکیش بە چاوانیاندا دەهاتە خوار.

گەیشتە ماڵەوە و گەشت بە ژن و کوڕ و کچەکانی لە شێوازێکدا کە ئەو شێوازە نەبوو کە رۆشتبوو، ژنەکەی هەوڵی نەدا دڵخۆشی و ئاسودەیی خۆی بە بینینی ئەو دیمەنە بشارێتەوە، بۆیە دەستی کرد بە گریان و لە ئامێزی گرت و ئەویش گریا و سەری ماچ کرد و بەدەم گریانەوە یەکەیەکە کچ و کورەکانی ماچکرد، پاش چەند ساتێکی کەم هەستایەوە تاوەکو بچێت بۆ نوێژکردن لە مزگەوتەکەی تەنیشتیان.. نیشانەکانی چاکەکاری لە رووخساریدا دیاربوون، ریشی هێشتبوویەوە کە مووی سپی تێکەوتبوو، لە رووخساریدا نیشانەی ئاسوودەیی و بەختەوەری دەبینرا، وەك ئەوەی تازە لە دایك بووبێت.

بەم شێوازە ماوەیەکی زۆر تێپەڕی، داوای لە ئیمامی مزگەوتەکە کرد کە یارمەتی بدات لە بانگدانی رۆژانەدا، ئەویش رەزامەندی نواند دوای ئەوە بوو بە بانگبێژی فەرمی مزگەوتەکە، دوای ئەوەی بانگبێژەکەی تر

وەفاتیکرد، پاشان ئامادە دەبوو لە بازنەکانی فێربوونی قوئان و زانست و وانەکانی مزگەوتدا، پاشان بڕیاریدا قورئانی پیرۆز لەبەر بکات، دەستی کرد بە لەبەرکردن و هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد.. لەو ماوەیەدا هاورێ گەنجە بەسۆزەکەی بەبەردەوامی سەردانی دەکرد و کەسانی چاکە خوازی پێ ئاشنا دەکرد. تا بوویە یەکێك لە بانگخوازن بۆ ڕێگای خوا و لەسەر دەستی ئەم زۆرێك لە هاوڕێکانی ڕێنمایکران، ئەوانەی کە پێشتر لە گەڵیدا عارەقیان دەخواردەوە، پاشان بوو بە ئیامی مزگەوتەکە و تا ئێستاش بەردەوامە و سوپاس بۆ خوای گەورە یەکێکە لە بانگخوازان و ئیمامی مزگەوتی ئەو گەرەکە.

تێبینی: ئەم چیرۆکە لە چنروای ئەندێشە و خەیاڵ نیە و دەمانتوانی ناوەکان بلاوبکەینەوە، بەلام خاوەنەکانیان حەزیان بەوە نەکرد.

سایتی (موسوعة القصص الواقعية) لە ئینتەرنێتەوە

## چیرۆکی کوڕ و کچێکی لاوی ئیماندار

دەگێڕنەوە کە لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا کوڕێکی گەنجی خواناس داوای زانستی دەکرد و خۆی یەکلایی کردبوەوە بۆی، بەلاّم هەژار و نەداربوو.

رۆژێکیان بە هۆی برسیەتیەوە لە ماڵ چووەیە دەرەوە، چونکە هیچی شك نەدەبرد تا بیخوات بۆیە لە ئەنجامدا رێی کەوتە باخێ کە پڕبوو لە درەختی سێو، لقی دارسێوێك شۆڕبووبوویەوە بۆ سەر رێگاکە، ئەمیش کەوتە وتوێژ لە گەڵ خۆیدا کە ئایا ئەو سێوە بخوات و برسیەتیەکەی نەمێنێت و خۆ کەس نایبینێت و ئەو باخەش بە هۆی یەك سێوەوە کەم ناکات، بۆیە سێوێکی لێکردەوە و دانیشت و خواردی تا برسیەتیەکەی نەما، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دەروونی لۆمەی دەکرد ئایا ئەوە پیشەی ئیمانداری راستەقینەیە، دانیشت و بیری دەکردەوە و دەیووت چۆن ئەو سێوەم خوارد و ئەوە ماڵی موسڵمانەو من مۆڵەتم وەرنەگرتووە لێی، داوای گەردن ئازادیم لێنەکرد.. بۆیە رۆشت و گەڕا بە دوای باخەوانەکەدا هەتا

دۆزیەوە و لاوەکە پێی ووت: مامە گیان من دوێنێ برسیەتی زۆری بۆ هێنابووم و منیش سێوێکم لە باخەکەت خوارد بە بێ ئەوەی تۆ بزانیت ئەوەتا تا ئەمڕۆ من هاتووم گەردنم ئازاد بکەیت.

باخەوانەکەش پێ وت: بەخوا گەردنت ئازاد ناکەم و لە رۆژی قیامەتدا بەرۆکت دەگرم.

کوڕە گەنجەکەش دەگریا و دەپاڕایەوە تا گەردنی ئازاد بکات و پێی وت: من ئامادەم هەر کارێکت بۆ بکەم بە مەرجێ لێم خۆش ببیت و گەردنم ئازاد بکەیت.. و هەر دەپارایەوە لە خاوەن باخەکە و خاوەن باخەکەش زیاتر سوور دەبوو لەسەر قسەی خۆی، بۆیە رۆشت و بەجێی هێشت، کوڕە لاوەکەش کەوتە دوای و دەپاڕایەوە لێی هەتا باخەوانەکە رۆشتە ماڵی خۆیان، لاوەکەش لەبەردەرگاکەیاندا وەستاو چاوەڕوان بوو تا بۆ نوێژی عەسر پیاوەکە بێتە دەرەوە و کاتێك باخەوانەکە لە ماڵ هاتەدەر و بینی هێشتا لاوەکە وەستاوە و فرمێسك بەڕیشیدا دێتە خوارەوە و زیاتر نور و رووناکی بەخشیوە بە روخساری..

لاوەکە بە باخەوانەکەی وت: مامە گیان مـن ئامـادەم وەك جوتیارێك لەباخەکەتدا کاربکەم بە بێ کرێ و بەدریـژایی ژیانم یا بەهەر شێوەیەك تـۆ پێت بـاش بێـت بـەڵام بـەو مەرجەی لێم خۆش بیت.

لەوکاتەدا باخەوانەکە کەوتە بیرکردنەوە و پاشان وتـی: کوڕی خۆم من ئامادەم لێت خۆش ببم بەڵام بـە مـەرجێك، لاوەکە گەشایەوە و بە روویەکی گەشاوەوە و خۆشەوە وتـی: مامەگیان چ مەرجێکت هەیە بیڵێ.

باخەوانەکە وتی: مـەرجی مـن ئـەوەم هەیـە کـچەکەم بخوازیت!!!

لاوەکەش زۆر سەرسام بوو بـەو وەڵامـە و هـەرگیز ئـەو مەرجەی بە مێشکدا نەدەهات، پاشان باخەوانەکـە وتـی: بەڵام کوڕی خۆم حەز ئەکەم کە بزانیت کچەکەی من کوێرە و کەڕە و لاڵیشە و هەروەها ئیفلیجیشە و نـاتوانێ جووڵـە بکات، منیش ماوەیەکی زۆرە دەگـەڕێم تـا مێردێکـی بـۆ پەیدا بکـەم و متمانـەم هـەبێت پـێ و رازی بێـت و بـەو هەموو ناتەواویەی باسمکرد، ئەگەر تۆ رازی بیت پێی ئەوا

لێت خۆش دەبم، لاوەکە جارێکی تریش تووشی سەرسامی بوویەوە.

پاشان هەر بیری دەکردەوە کە چۆن لە گەڵ ئەو هەموو نارەحەتیەدا بژی بە تایبەتی ئەم هێشتا لە هەرەتی لاویەتیدایە؟ و چۆن ئەو ئافرەتە هەڵدەستێت بە کاروباری خۆی و بەرێوەبردنی ماڵ و گرنگیدان بەم، لە کاتێکدا بەوشێوەیە بێت؟

هاتەوە بەخۆیدا و بەخۆیی وت، ئارمبگرە لەسەری لە دنیادا و با رزگارت بێت لە تاوانی ئەو سێو خواردنە!!!

پاشان روویکردە باخەوانەکە و پێی وت: مامە گیان ئەوە من رازی بووم بە کچەکەت و داواکارم لە خوای گەورە پاداشتی نیاز و نیەتم بداتەوە و بە هۆی ئەوەوە بەخێر قەرەبووی بکاتەوە بۆم.

باخەوانەکە وتی: زۆرباشە کوڕی خۆم ژوانی ئێمە پێنج شەممەی داهاتووە.. دەبێت بێیت بۆ ماڵی خۆمان و دەعوەتیت بۆ ژن هێنانەکەت و منیش مارەییەکەت دەگرمە ئەستۆی خۆم، رۆژی پێنج شەممە لاوەکە بە

لەشێکی قورسەوە و بەدڵشکاویەوە هەنگاوی دەنا بەرەو لای ماڵی پیاوەکە، نەك وەك زاوای تر بە دڵخۆشی و شادیەوە لە رۆژی زەماوەندا، کاتێ لە دەرگایدا باوکی کچەکە دەرگای بۆ کردەوە و بردیە ژوورەوە و دوای ئەوەی کەوتنە وتووێژ پێی وت: کوڕی خۆم فەرموو برۆ ژوورەوە بۆ لای ژنەکەت، یاخوا پیرۆزتان بێت و خوای گەورە بەرەکەت و خۆشی بخاتە ژیانتانەوە و لەسەر خێر و چاکە کۆتان بکاتەوە.

باوکە دەستی لاوەکەی گرت و بردیە ئەو ژوورەی کە کچەکەی لەوێ دانیشتبوو، کاتێ کوڕەکە دەرگاکەی کردەوە بینی تەماشا دەکات ئافرەتێکی سپی پێستە و جوان وەك مانگ وایە و قژی وەکو ئاوریشم بەسەرشانیدا شۆڕبووەتەوە و پاشان کچەکە هەستایەوە و بە باڵایەکی شۆخ و شەنگەوە بەرەو لای کوڕەکە رۆشت و سڵاوی لێکرد و وتی: سڵاوت لێبێت مێردی بەرێزم..

لاوەکە لە شوێنی خۆی حەپەسا و هەر سەرنجی دەدا، وەك ئەوەی لەبەردەم حۆریەك لە حۆریەکانی بەهەشتا

وەستابێت، کە دابەزێتە سەر زەوی.. بڕوای نەدەکرد بەو دیمەنە و نەیدەزانی چی روویداوە و بۆچی باوکی کچەکە ئەو قسانەی کرد، بۆیە کچەکە تێگەیشت کەچی دێت بە خەیاڵی مێردەکەیدا و چوو بۆ لای و تەوقەی لەگەڵ کرد و دەستی ماچ کرد و و وتی: بەڵێ ئێستا تۆ سەرسامیت سەبارەت بە قسەکانی باوکم، راستە من کوێرم لە ئاست تەماشاکردنی حەرام و لاڵم لە ئاست قسەکردنی حەرام و کەڕم لە ئاست بینینی حەرام و قاچەکانم بەرەو شتی حەرام هەنگاو نانێن، وە من تاکە منداڵی باوکمم و چەندین ساڵە باوکم دەگەڕێت بەدوای مێردێکی صاڵحدا بۆ من، کاتێك تۆ هاتیت و داوات لێکرد کە لێت ببورێت و گریایت لەبەردەمیدا باوکم وی: ئەوکەسەی لە خواردنی سێوێك بترسێت کە مافی ئەوەی بەسەرەوە نیە، ئەوە باشتر لە خوا دەترسێت بەرامبەر بە کچەکەم، پیرۆزبایی لە باوکم دەکەم کە تۆی بە نسیب بوو.

دوای ساڵێك ئەو ژن و مێردە منداڵێکیان بوو کە لە ناو ئەم نەتەوەیەدا نموونەی کەمە ئایا دەزانی ئەو منداڵە کێ بوو؟

ئیمامی ئەبوو حەنیفە خاوەنی مەزهەبی فیقهی بەناوبانگی حەنەفی کە بە مەزهەبی حەنەفی ناسراوە

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ ... ۝٣﴾(الطلاق).

واتە( ئەوەی لە خوابترسێت و پاریزکار بێت خوای گەورە دەرووی لێدەکاتەوە و رۆزی دەدات بە شێوەیەك کە بە خەیاڵدا نەهاتووە)

سەرچاوە: (واحات الصحبة الصالحة).

## لاوێك! نەك وەك لاوانی تر

ڕەیان... لاوێك بوو هێشتا تەمەنی نەگەشتبووە پانزە ساڵ، بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە وتی: باوکە بۆکوێ دەچیت؟ باوکە بیرت نەچێت دایکم دەوێ... دایکم دەوێ

باوکی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە و کوڕەکەش هەر دەیووت دایکم دەوێت... دایکمم دەوێت؟

کوڕی خۆم دایکت بە دەستی ئەو دوژمنە ستەمکارانە کوژرا، روخساری ڕەیان سوور هەڵگەڕا و لێوی شین بوویەوە و بە هۆی بیستنی ئەو قسانەوە هاتە لەرزین و پاشان هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و بە کوڵ دەستی کرد بە گریان و باوکیشی هێوری دەکردەوە.

ڕەیان کەمێك هێمن بوویەوە و لە کۆشی باوکیدا خەوی لێکەوت و باوکەش منداڵەکەی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە هەڵگرت و خستیە سەر جێگاکەی خۆی و لە پاڵیدا خەوت و بۆ سبەینێ ڕەیان لە باوکی پرسی:

- ئەو دوژمنەی دایکمی ـوشت کێ بوو؟

باوكیشی وتی: رۆڵە گیان ئەوانە دوژمنی ئیسلامن... جولەكەكان... بە وردی باسی جولەكەكانی بۆ كرد.

چەند ساڵێك تێپەڕی و رەیان لە لای مامە ئیبراهیمی گەورە بوو، دوای ئەوەی باوكی لە یەكێ لە چالاكیە فیداكاریەكاندا شەهید بوو، ئەو كاتە تەمەنی رەیان كەمێك لە سەرووی دە ساڵانەوە بوو، شەهید بوونی باوكی كاری تێنەكرد و هەمیشە ئەم ئایەتەی دەوتەوە ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩﴾.(آل عمران)

واتە: وا مەزانن ئەوانەی لە پێناوی خوای گەورەدا دەمرن (شەهید دەبن) ئیتر مردوون، نەخێر بەڵكو ئەوانە لای پەروەردگاریان زیندوون و رۆزی پێدراون.

رەیان گەورە بوو، بووە لاوێكی صالح و جوامێر و خەمی ئاین و نەتەوەكەی هەڵگرتبوو، وە خۆی نەزركردبوو بۆ بەرزكردنەوەی وشەی (اللّه) بە هەر نرخێك بێت، پەیوەندی كرد بە كەتیبەكانی سەربەرزی فیداكاریەوە لە

سێ یەکی کۆتـایی شـەوێکدا کـە مێـژوو هـەرگیز بـیری ناچـێتەوە، خـەڵکی خەبـەریان دەبێتـەوە بـە دەنگـی تەقینەوەیەکی زۆر گەورە کە کارێکی خۆشەهید کردن بوو.

ئایا دەزانن کێ بوو پاڵەوانەکەی؟!

ڕەیان بوو کە زەوی فەلەستینی بە خـوێنی خـۆی پـاراو کـرد و بیـست جولەکـەی کوشـت و لاپەڕەیـەکی نـوێی فیداکاری تۆمار کرد.

سەرچاوە (واحات الصحبة الصحابة)

## دوو هەتیوەکە

**لە شاکارەکانی شێخ (الطَنْطَاوِي) رحمه الله.**

**ماجید هەستیکرد کە هیچ تێناگات لە خوێندنەوەکەی خۆی، چاوی تەنها پیت و وشەکان دەبینێت، بەڵام بیر و هۆشی لە ماناکانی تێناگات، ئەو بیر لە وانەکەی ناکاتەوە، ئەو بیر لەو تاوانبارە دەکاتەوە کە چۆن ژیانی خۆی و خوشکە هەژارەکەی تێکدا و کردی بە دۆزەخ، تەماشایەکی ساڵنامەکەی کرد و بینی تەنها یەك هەفتەی ماوە بۆ تاقیکردنەوە و پیویستە خۆی ئامادە بکات و سەعی بکات، ئەی باشە چۆن خۆی ئامادە بکات و چۆن سەعی بکات؟ لە کوێی ئەو ماڵەدا شوێنێکی ئارامی دەست بکەوێت بە هۆی ئەو ژنە خراپەی کە ئازاری دەدات و نایەڵێت بۆ ساتێك پشوو بدات و کاتێکیش واز لەم دێنێ دەچێت بەرۆکی خوشکەکەی دەگرێت، ئایا رازی دەبێت بە خۆی کە لە یەکەم ساڵیدا کە چووەتە ناوەندی بکەوێت... ئەو لە قۆناغی سەرەتاییدا هەمیشە پێشەنگی هاورێکانی و یەکەمی پۆلەکەی بوو.**

بۆیە هەر بیری دەکردەوە لە پڕ گوێ لە دەنگی ڕەشەبایەکەوە بوو، ئەو ڕەشەبایەی لە مانگێکدا جارێك هەڵدەکات بۆ کێڵگە و ریشك لە بن دەردێنێت و لق و پۆپەکان دەشکێنێت، پاشان باران دەبارێت و زەوی پاراو دەکات، خۆر هەڵدێت و ئەولقانەی شکاونەتەوە سەر لەنوێ گەورە دەبن و لقی نوێ لێدەدەن، بەڵام ڕەشەبا و گەردەلولی ئەم ماڵە هەموو سەعاتێك هەڵدەکات و دڵی ئەم و دڵی خوشکە تەمەن شەش ساڵەکەی دەشکێنێ.

دەڵێی گەردەلولی کێڵگە بەبەزەیی تر و دڵناسکتر و مرۆڤانەترە لەو ئافرەتەی کاتێ کە دەیبینی جوان و ڕێك و پێك دیارە... بەڵام وەکو مار وایە لە سیفەت و مەکر و جوڵەیدا.

گوێی لە جنێو و دەنگی دەستیەوە بوو شەکەت بوو، پاشان دەستی کرد بە لێدانی کچە بچکۆلەکە، ئەم نەیتوانی هەستێتەوە و نەیشیتوانی بەرگری لە خۆشکەکەی بکات لە ترسی باوکی، ئەو باوکەی کە هاوکاری ئەم ئافرەتەی دەکرد و کۆمەکی دەکرد بۆ لێدانی

ئەو منداڵە بەستە زمانانــە و ناشــرین کردنــی ژیــان لــە لایــان، پــێش ئــەوەی بــزانن کــە ژیــان مانــای چییە.. لــە پەنجەرەکەوە وەســتا بــوو، خوشــکەکەی بینــی دەســتی بــە دیوارەکـــەوە گرتبـــوو بزەرد هەڵگـــەڕاو و پۆشـــاك دڕاو و خوشکەکەشی لە پاڵیدا بەدڵ شکاویەوە، لە دڵی خۆیـدا دەیووت ئەم داماوە گوناهی چیە ئاوا ســزا دەدرێـت؟ ئایـا جێی ئومێدی باوکم نەبوو؟ ئایا ئازیزترین مرۆڤ نەبوو لــە لای.

ئەی بۆچی ئێستا ئاوا زەلیــل و بێــزراوە... لــەوماڵــەدا تەنها جنێو و لێدان و سوکایەتی دەبینرا، بەڵام لاواندنــەوە و نازپێدان بۆ ئەو خوشکەی کە دوو ساڵ لەم کچە منــاڵتر بوو وەك ئەوەی تاقانە بێت، ئەمیش وەکو کارەکەری مــاڵی باوکی وابوو، بەڵکو خراپتر لە کارەکەر، کارەکەر زۆر جــار خزمەتی کەسانێك دەکات کە دڵیان هەیە و خوا دەناسن و وەکو کچی خۆیان مامەڵە دەکەن لەگەڵیدا... خوای گەورە لە چارەی ئەم کچەی نووسیبوو کە هەتیو بێت و بێ دایـك

و باوك بێت، دایکی وەفـاتیکرد بـوو، باوکیـشی ویـژدانی مـردبوو، بۆیە باوکیشی نەمابوو.

گوێی لە دەنگی باوەژنیەوە بوو بانگی دەکرد: وەرە ئـەی بەراز لە گەڵ تۆمـە.. بەو ناوەوە بانگی دەکرد (بەراز) تەنها بەو ناوەوە بانگی دەکرد، کاتێکیش باوکی دەگەرایەوە پێـی دەوت: کچێ وەرە، کچێ برۆ.. بەڵام خوشکەکەی زۆر ئـازیز و خۆشەویـست بـوو.. دەیـوت: تـۆ لـەکوێی ئـازیزم ؟وەرە ئازیزم... دەنگێك لەناکاو بەرز بوویەوە: گوێـت لـێ نییـە خوشکەکەت دەگـری؟ بزانـە چـی دەوێـت بیـدەرێ؟ ئـەوە کەریت؟ بلێ چیت دەوێ؟

ئەو کچە داماوەش بـە دەنگێکـی کپـەوە وەڵامـی دایـەوە: نەستەلەی دەوێت..

- ئەی بۆچی وەکو ورچ وەستاویت، برۆ چی دەوێت بیدەرێ، ئەو داماوە وەستا و نەیدەزانی چۆن بۆی روون بکاتەوە کـە ئەو پارچە نەستەلەیەی کە ماوەتـەوە هـی ئـەوە.. دوێـنێ باوکی پاکەتێك نەستەلەی کری و دای بە کچە بچوکەکەی و ئەو خـواردی و ئـەمیش هـەر تەماشـای دەکـرد، کـچە

بچووکەکە زۆری بۆهات لە تەماشاکردنی نەستەلەکە و پارچەیەکی لە نەستەلەکە بۆ هەلّدا و وەك چۆن مرۆڤیك شتێك بۆ پشیلەیەك هەلّدەدا، کە کاتێ شت دەخوات و هەر سەرنجی دەدات، کچە داماوەکەش پارچە نەستەلەکەی بە دلّخۆشیەوە هەلّگرت و نەیوێرا بەو حەزە زۆرەیەوە لەوێدا بیخوا، بۆیە بەشاردیەوە هەموو سەعتێك جارێك دەرۆشت تا بیبینێت و دلّنیا بێت، جارێکیان زۆر حەزی لێکرد و دەری هێنا و بەدانەکانی گازێکی لێگرت و خوشکە نازپێدراوەکەشی بینی و داوای نەستەلەکەی دەکرد...

- کچە تیو نەستەلەکە؟

ئەویش بێدەنگ بوو... بەلاّم منداڵەکە وتی: دایە ئەوەتا لای ئەوە، لەوێیە ئەو لە منی سەند! بۆیە ئافرەتەکە منداڵەکەی خۆی و منداڵی مێرەکەی برد بۆ لێکۆلّینەوە، کاتێ باوەژنەکە بینی نەستەلەکە لای ئەوە کارەسات روویدا.

- هەی دزی نەفرەت لێکراو، دایکت ئاوا فێری کردویــت.. شتێ دەدزی کە هــی تــۆ نیــە، ماجیــد بەرگــەی هــەموو شتێکی دەگرت تەنها بەرگــەی ســوکایەتی نــەدەگرت بــە دایکی کاتێ بینی باسی دایکی دەکــات، نــەیتوانی خــۆی بگرێت و هاواریکرد: من رێگات پــێ نــادەم بــەو شــێوەیە قسە بە دایکم بڵێی.

هەمیشە باوەژنی تــوورە دەبــوو لێــی و ئــازاری دەدا بــە بەردەوامی، ئەویش بێدەنگ دەبوو، نەیدەتوانی هیچ بکــات و باوەژن ئاواتی دەخواست کە شتێکی بکردایە تا ئەوەنــدە تورەبێت لێی بە دڵی خۆی، ئەوەتا بەهانەی بــۆ پەیــدابوو، رێگا بە من نادەیت؟ تکات لێ دەکەم بەگم کە رێگام پــێ بدەیت... ئاه ! ئایا ئەوەندە بــەس نیــە کــە مانــدوو دەبم و خواردنت پێشکەشە دەکەم و خزمەتت دەکــەم و تــۆش بــۆ هیچ شتێ ناشێت، تەنها نوســینەوە نــەبێت لــەو دەفتــەرە رەشەدا، هەرچی ماندووبوونی من بــوو بەرامبــەر بــە تــۆ بەزایە چوو ئەی نەفرەت لێکراو، بەڵام هیچ سەیر نیــە تــۆ کوڕی دایکتیت.

- پێم وتیت باسی دایکم مەکە، ئەگینا بێدەنگت دەکەم.

لێی نزیك بوویەوە و قیژاندی بەسەریدا و دراوسێکان گوێیان لێ بوو: دەتەوێ لە من بدەیت؟ ئەی ناپاك، ئەی سپڵە، ئەی خەڵکینە فریاکەون..

دراوسێکان کۆبوونەوە، ماجید بەرەو ژوورەکەی خۆی رۆشت یان بەرەو ئەو گۆشەیەی ناویان لێنا بوو ژوور.. جیایان کردبویەوە بۆ ئەو، تاوەکو باوەژنی هەمیشە نەبینێت، باوکی ئێوارە گەڕایەوە، هەروەك نەریتی جارانی مۆن و گرژ دیار بوو، بەدەم منداڵەکانیەوە پێنەدەکەنی، تاوەکو زاڵ نەبن بەسەریدا و پەروەردەکردنیان و رەوشتیان تێك نەچێت.. جاران وانەبوو، بەڵام لەوەتەی ئەو ژنە نەفرەتیەی هێنا بوو وای لێهاتبوو، ئەو ئەژدیهایە ژەهریشی کردبووە لەشی ئەوەوە و خستبوویە مێشکی کە ماجید و خوشکەکەی دوو منداڵی نازپێدراوی خراپن و تەنها توندوتیژی لەگەڵ ئەواندا سووی هەیە.

ئەو ئافرەتە زۆر پیس بوو، ئەگەر کاتی هاتنەوەی مێردەکەی بهاتایە پۆشاکەکانی دادەکەند و پۆشاکی نوێی

لەبەردەکرد.. وەك چۆن رووخسارە شەیتانیەکەی خۆی دەگۆڕی بۆ روخسارێکی پاك و منداڵانە، مەکر و پیسیەکەی زاڵ بووبوو بەسەر مێردەکەیدا، ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە دوو کچەکەی پاك و تەمیز دەکرد و پۆشاکی وەك یەکی لەبەر دەکردن تا مێردەکەی هەست نەکات فەزڵی کچەکەی خۆی دەدا بەسەر کچەکەی تردا.

مێردەکەی هاتەوە و زۆر بە سۆز و جوانی و رووخۆشیەوە پێشوازی لێکرد و بەڵام لە روخساریدا جۆرێك لە ئازاری بێتاوانانە دیاربوو، وەك ئەوەی کە داماو بێت و زوڵمی لێکرابێت، مێردەکەشی هەستی پێکرد و زۆری لێکرد تا رازی دڵی بدرکێنێت، ئەویش بەسەرهاتێکی درۆینەی شێواوی بۆ گێڕایەوە و سینەی مێردەکەی پڕکرد لە رق و کینە بەرامبەر منداڵەکانی، بۆیە چووە دەرەوە و هیچی نەدەبینی لەبەردەمیدا، بانگی کچەکەی کرد و ئەویش بە ترس و لەرزەوە هات وای دەزانی بەرەو مردنی دەبەن، لەبەردەمیدا وەك ئەوەی کاوڕێك لە بەردەم پڵنگێکدا وەستابێت، باوکە لەسەر کورسیەکی بەرز

دانیشت، وەك ئەوەی دادگایکردن بێت و کچەکەشی لەبەردەم خۆیدا وەستاند وەك ئەوەی تاوانبارێك بێت، کە بەڵگەی لەسەر کۆکرابێتەوە، باوکە باسی قیزەونی و ناشرینی دزی بۆ دەکرد و سەرزەنشتی کرد و قسەی پێوت، وە بە چاوی سەرزەنشتەوە تەماشای ماجیدی کوڕی دەکرد و تەماشا کردنەکەی توڵە و هەڕەشەی لێدەبینرا.

بۆیە ماجید نەیتوانی بیدەنگ بێت لە کاتێکدا کە خوشکەکەی تۆمەتبار دەکرێت بە دزیکردن، لە راستیشدا بێتاوانە.. بۆیە داوای لە باوکی کرد کە ئەو مەسەلەیەی بۆ روون بکاتەوە، تەنها بەو هەڵوێستەی گۆبەنی تۆشی خۆی کرد.

بورکانەکە تەقیەوە و باوکیان دەستی کرد بە نرکەر و ناڵە و بە تووڕەیی و ئۆقرە لێبرانەوە وتی: دەتەوێ لە باوەژنەکەت بدەیت، هەی بێ ئەدەب، هەی بێ تەربیەت، هەی نەفرەتی، وا دەزانی کە گەشتیتە تەمەنی چواردەساڵی ئیتر بوویت بە پیاو، ئایا پیاو لە باوەژنی خۆی دەدات؟ بەخوا دەستت ئەشکێنم هەی سەرسەری.

+ بەخوا باوکە ئەوە راست نیە...

- ئای لەو بێ تەربیەتیە، ئەڵێی شەرم و حەیات نەماوە، باوەژنەکەت بەدرۆ دەخەیتەوە.

+ بەخوا من بە درۆی ناخەمەوە بەڵام شتانێك دەڵێت كە راست نیە.

لەوکاتەدا باوکە هەستایەوە و بەو پەڕی رق و تورەیی و هێزەوە بەربوە کوڕەکەی و بە هەموو هێزێکەوە وەك شتێکی بێگیان، کەوتە لێدانی و تەنها بە لێدان سوکنایی بۆ نەهات و بەڵکو هەڵمەتی بردە سەر دەفتەرە گەورەکەی کە وانەکانی تێدا نووسیبوویەوە و بەتەواوی دڕاندی و پاشان خوشکەکەی کردە گۆشەیەکەوە و نەیهێشت نانی ئێوارە بخوات، وەك سزایەك و سوکایەتی پێکردنیان.

ژن و مێردەکە و تاقە کچەکەیان نانی ئێوارەیان خوارد و پاشان چوونە سەر نوێنەکانیان و کوڕەکەش لە جێی خۆی حەپەسا بوو.. تەماشای ئەو دەفتەرەی دەکرد کە شەونخونی پێوە کێشابوو.. کە لە پێناویدا خەو و خۆراکی لە خۆی تاڵ کردبوو، کە وای دەزانی رووناکی چاوی و

بەهاری تەمەنیەتی و ئومێد و ئایندەی خۆی لەسەر بنیات نابوو... پاشان هەستا و پارچەکانی کۆکردەوە وەك چۆن دایك پەلو پۆی مندالّی کۆدەکاتەوە کاتێك بۆمبێك دەتەقێتەوە پیایدا.. بەلاّم تازە بێ کەڵك بوو، کۆکردنەوەی سوودی نیە و نابێتەوە بە دەفتەرێك کە سەعی تێدا بکات، مەگەر کاتێك پەلوپۆی مرۆڤێکی پارچە پارچە بوو بێتەوە بە مرۆڤێکی ساغ و قسە بکات و بڕوات بەڕێوە... بۆیە دڵنیا بوو کە ئەمساڵ دەکەوێت و دەرناچێت و ئەمساڵی دەفەوتێت... کارەکە زۆر گەورە بوو بەلایەوە.. مێشکی بەرگەی ئەو هەموو زوڵمەی نەگرت و وای هەست دەکرد کە دنیا دەیسورێنیتەوە و گێژی دەدات.. ڕۆژەکانی ژیانی وەك فیلمێکی سینەمایی دەهاتە پێش چاوی.

روخساری سۆزداری دایکی بینی، خەندەی دایکی کە ناسۆریەکانی دنیای لەبیر بردبوویەوە، و سینەی کە لە کاتی نارەحەتیدا پەنای بۆ دەبرد، بینی دایکی گەنجە و تەندروستە و ماڵەوەی بینی کە زۆر هێمنە و پڕە لە سۆز و خۆشەویستی و باوکی خۆی بینی باوکێکی ڕاستەقینە کە

گیانی پڕبوو لە سۆزی باوکایەتی و لە چاوانیدا دەبینرا، و دەستە پڕ لە سۆز و نەرمەکانی و زمانە شیرینەکەی و قسە بەتام و شیرینەکانی...

فیلمەکە گۆڕا و دایکی بینی نەخۆشە و گوێ نادات بە نەخۆشیەکەی دایکی و وای دەزانی نەخۆشیەکی سادەیە، پاشان ماڵی بینی کە تەواو تیکچووە و هەمووان ماتەم و غەمبارن و گوێ لە دەنگی شین و گریان بوو، دەیبینی کە ئەم دوور دەخەنەوە و هەواڵی پێنادەن، بەڵام تێگەیشت کە دایکی وەفاتی کردووە و مردووە.. وشەیەك بوو کە زۆر گوێی پێنەدا، پێشتر وشەی مردنی بیستبوو، لە کتێبەکاندا خوێندبوویەوە، بەڵام لە نزیکەوە و لە ماڵی خۆیاندا نەیبینیبوو، تامی مردنی ئازیزێکی خۆی نەکردبوو، بەڵام رۆژگار بە خێرایی فێریکرد کە مردن چیە، کاتێ سبەینێ بە گریانی خۆشکە نازدارەکەی لای دایکی خەبەری بوویەوە کە لەو رۆژانەدا خۆشەویستی باوکیشی بوو، کاتێ کوڕەکە چاوی کردەوە، دایکیشی لە

تەنیشت خۆیەوە نەبینی کە خوشکەکەی بنیّ بەسنگیەوە..
کچەکە زیاتر دەگریا، کورەکە هاواری کرد:
- دایکە.. دایکە.. پاشان لە جێگاکەی هەستا و گەڕا بەدوایدا.. باوکی بینی لە گەڵ کۆمەڵێك خزمی تریدا، ئەوانیش هەموویان دەگریان.. لێی پرسین:
- کوا دایکم؟!.
وەڵامیان نەدایەوە.. کاتێ ویستی بڕوات بۆ قوتابخانە، بانگی دایکی کرد، بەڵام دایکی دیار نەبوو تا جانتاکەی بۆ ئامادە بکات و پۆشاکەکانی لەبەر بکات و لەپشت دەرگاکەوە نەبوو تا خواحافیزی لێبکات و ماچی بکات و ئامۆژگاری بکات، کە شەڕ لەگەڵ کەسدا نەکات و لە کۆڵاندا یاری نەکات و پاشان خەریك بوو دووردەکەوتەوە و دووبارە بانگی دەکردەوە تا ماچی بکات و ئامۆژگاری بکات.. کاتێکیش کە گەڕایەوە لە قوتابخانە ئافرەتێکی نامۆی بینی، شیری دەدا بە خۆشکەکەی... بۆچی ئافرەتێکی نامۆ شیری پێدەدات ئەی کوا دایکم ؟!

فیلمەکە گۆڕا، باوکی سۆزداری بینی، کە هاوڕێیـەکی بەسۆز بوو بۆی و هەوڵی دەدات کە ببێت بـە بـاوك و بـە دایکیش، بۆ ئەم و خوشکەکەی، بەڵام ئەو باوکە لـەو ڕۆژە شوومەوە گۆڕا.. بۆیە ئەو ڕۆژە شوومـەی بینی، ئـەو ڕۆژەی پێی ووت: ماجید دایکێکی تازە دێت بۆ لات... دایکێکـی تازە ؟؟!!

ئەوە ووشەیەك بوو پێشتر نەیبیستبوو، ئەو دەیزانـی چـۆن خوشکێکی تازە دێت بۆ لای، بێگومان لە سکی دایکیـە، بەڵام دایك لە کوێـوە لـەدایك دەبێـت؟ چـاوەڕوانی کـرد.. دایکــە نوێیەکــە هــات و جــوان و خۆشەویــست بــوو.. کۆڵمــەکانی و لێوەکـانی ســوور بــوون..نــەك وەك لێــوی کەسانی تر.. سەرسام بوو لە ڕەنگی لێوەکانی بەڵام خۆشی نەدەویست و گوێی پێنەدەدا.. لە ڕۆژانی یەکەمیدا سۆزدار و هێمن بوو.. وەك کێڵگەیەکی بچوك و لاواز بەڵام ڕۆژگـار تێپەڕی و جێگیر بوو لە زەویدا و تۆوی خـۆی تێـدا چـاند، وەك بیابان وشکەڵان بوو.. هەرچـەندە فێڵـی لـە بینـەران دەکرد بە گەلا ناسك و ً لـە جوانـەکانی کـاتێکیش ئـەو

کچە لە دایك بـوو، ئـەو شـەیتانە لـە شـێوەی مارێکـدا دەرکەوت لە پێستی ئافرەتێکی جواندا.

وێنە و فیلمەکانی رابردوو تەواو بوون و تەنها ئەم وێنـە ناشرینەی ئێستا دەهاتە بەرچاوی، دەیبینی گەورە دەبێت و هەموو ژیانی داگیر دەکات، هەرچی یادگاری و روونـاکی و ئومێدە لایبرد لەبەرچاوی.. گـوێی لـە قاقـاو پێکەنینـەوە بوو، راپەڕی و وای هەست دەکرد ئەوانە فیشەکن و دەنرێن بەسەر دڵی ئەمەوە، پێکەنینی ئەو ئافرەتە بوو کـە جێـی دایکی گرتبوویەوە لەگەڵیدا پیکەنینی باوکیشی تێکەڵی دەبوو... بێـدەنگ بـوو، گـوێی لـە گریـانێکی هێـواش و خەفتبار و بەردەوامەوە بوو، خۆشـکەکەی بیرکەوتـەوە کـە فەرامۆشی کردبوو، برسیەتیەکەی هاتەوە یاد کـە بـە بـێ شێو ماوەتەوە، ئەو تاوانبارە بە درێژایی رۆژ خزمـەتی خۆی و منداڵەکەی پێـدەکرد، دەچـور دەرگـای مـەتبـەخی لـێ دادەخست و تەنها نانێکی دەدایە و بە دزیەوە خواردنی دەدا بە کچەکەی خۆی، باوکیـشی ئێـوارە دەهاتـەوە لەبـەردەم ئەودا باوەژنەکە پۆشاکی بێ تاوانی دەپۆشی و باسی لاوازی

و نەخۆشی کچەکەی بۆدەکرد ئەم کچە داماوە، نان ناخوات و تەماشای لەشی بکە، نەیبەین بۆ لای پزیشك؟ بەلاّم پزیشك چی بۆ دەکات، ئەمە خۆی سەرسەخت و بێ ئەدەبە، بانگی دەکەم بۆ نانخواردن، کەچی نایەت نان بخوات ئەم سەرسەختیەی لەناوی دەبات..

باوکیشی بانگی دەکرد و پێی دەوت کچە هەتیو ئەم سەرسەختیەت لەچیە؟ بخۆ ئەگینا لێت دەدەم، دەهاتە پێشەوە تا نان بخوات، ئافرەتەکەی دەبینی لە پشتی باوکیەوە تەماشای دەکرد و هەرەشەی لێدەکرد، دەیبینی کە دەموچاوی گۆڕاوەو دەڵێ دەموچاوی کەمتیارە و تۆقێنەرە.

ژنەکەش دەیوت بە مێردەکەی: پێم نەوتیت ئەو سەرسەختە پێویستی بە تەربیەتە، پیاوەکەش سەری رادەوەشاند و یەك زللەی دەکێشا بە روخساریدا و گوێی کاس دەکرد و فرێی دەدایە ژوورەکەی خۆی، نانی خواردنی ئێوارەشی بەو شێوەیە بووە.. ماجید خوشکەکەی هاتەوە یاد و چووە لای و بەرزی کردەوە و نای بە سینگیەوە:

- ئەوە چیتە؟ بۆچی دەگریت؟ ئازیزم بیدەنگ بە؟

+ برسیمە، برسیمە... لە کویّ خواردنی بۆ بیّنیّت، هەستا دەستی کرد بەگەڕان، بەختیان هەبوو، دەرگای ژووری مەتبەخەکە کرابوویەوە، چونکە هەمیشە قفلّی دەدا، لەسەر سفرەکە پاشماوەی خواردنی ئیّوارە مابوویەوە و بۆی هیّنا و ئەویش بە دلّخۆشیەوە خواردی، وەك ئەوەی هەرهەمان کچی نازپیّدراوی پیّشووبیّت، کە داوای هەرچی بکردایە بۆی ئامادە دەکرا و هیچ داوایەکی فەرامۆش نەدەکرا.. کوڕەکە پیّی ناخۆش بوو کە خۆشکەکەی دلّخۆشە، ئەگەر پاشماوەی خواردنی خوشکەکەی و باوکی بخوات و لە ژووری مەتبەخ خواردنی دزی بیّنیّت بۆی و ویّنەی رابردووی هاتەوە پیّش چاوی هیّرشی دەکردە سەری.. ویّنەی دایکی هاتە پیّش چاو بانگی دەکرد... ئەو خەیالّە بەرجەستە بووبوو لەبەرچاوی.. هەمیشە لە پیّش چاویدا دەیبینی تا بردیەوە بۆ رابردوو.. وە ئیّستای لەبیر بردەوە... خوشکەکەی بە هەتیوی و زولّم لیّکراو نەدەبینی بەلّکو

وای دەبینی کە منداڵێکی خۆشەویستە و دایکێکی هەیە کە بەسۆز بێت لە گەڵیدا و خۆشی بوێت.

دەفتەرە دراوەکەی و ئایندە لەدەست چووەکەی و ژیانە تاڵەکەی لەبیر چوویەوە و گوێی لە بانگکردنی رابردوەوە بوو کە دەهاتە بەر گوێی.. دەنگی دایکی:

- هەستە ئازیزم ئایا گوێت لە دەنگی دایکتەوە نیە هەستە با بچین بۆ لای دایکم.

کچەکە راچڵەکی و دڵی داخورپا، چونکە نەیدەزانی کە دایکێکی تری هەیە بێجگە لەو ئافرەتە نەگریسە، بۆیە ترسا و رازی نەبوو بڕوات بۆ لای، تاوانی ئەو ئافرەتە ئەوە بوو جوانترین وێنەی لە دەروونی ئەو منداڵەدا ناشرین کردبوو، کە ئادەمیزاد تا ئێستا ئاشنا بوو بێت پێی ئەویش وێنەی دایکە!!.

- وەرە با بچین بۆ لای دایکی ئازیزمان، دایکت ئەو لە شوێنێکی زۆر خۆشە لە بەهەشتایە، ئایا گوێت لە دەنگیەوە نیە؟

هەڵیگرت و دەرگای کردەوە و بردی بەرەو ئەو دەنگەی کە لە گوێدا دەزرنگایەوە و بەسۆز بوو بەلایەوە، بردی بۆ ئەو شوێنەی کە دایکی لەوێ بوو.

سبەینێ خەڵکی لە رۆژنامەکاندا هەواڵی ئەوەیان بیست کە پۆلیس شەو لەسەر قەبران منداڵێکی لەڕ و لاوازیان دۆزیوەتەوە کە تەمەنی شەش ساڵە و لەگەڵ کوڕێکی چواردە ساڵ، بردنیان بۆ نەخۆشخانە چونکە کچەکە لە گیانداندا بوو، برسیەتی و سەرما و ترس کاری تێکردبوو، رزگاری نەدەبوو لە مردن مەگەر بە سەمەرەیەك لە سەمەرەکانی قەدەر... بەلاّم کوڕە هەرزەکارەکە کە قسەکانی دەچۆڕاند یادی تاقیکردنەوە و دەفتەرە گەورەکەی دەکرد و دایکی بانگ دەکرد و ئەو ئافرەتەی کە لە ئەژدیهای دەکرد.

## چیرۆکی خزمانی مێرد مردنە

خالیــد لەنوســینگەکەیدا بەخەفــەتبارییی و غــەم و پەژارەوە دانیشتبوو.. (صالح)یش کەهاوڕێی بوو لەسەر کار هەستی بەو ماتەمی و پەژارەییە دەکـرد لـە ڕوخـساریدا، لەنوسینگەکەی هەستا و نزیك بوویەوە لـە خالیـدو پێـی ووت: خالید ئێمە هـاوڕێ و بـرای یـەکترین پـێش ئـەوەی هــاوڕێی ســەرکاربین، هەســتم پــێ کردویــت نزیکــەی هەفتەیەك دەبێت تۆ هەمیشە بیر دەکەیتەوە و زۆر بێزاریت و نیشانەی غەم و پەژارەیی لەڕوخسارتا دیارە، وەك ئـەوەی غەمی هەموو دنیـات هـەلگرتبێت.. تـۆ بـاش دەزانیـت خەڵك بۆ خەڵکە و هەموان برای یەکترن بۆ خوا.

خالید کەمێك بێدەنگ بـوو، پاشـان ووتـی:(صـالح)ی هــاوڕێم سوپاســت دەکــەم.. ئەمــە هەســتێکی جوانــە... بێگومـان مــن هەســت دەکــم پێویــستم بەکەسـێك هەیـە غەمەکانم و کێشەکانمی لا باس بکـەم.. بـەڵکو یارمــەتیم بدات لە چارەسەرکردنیدا..

خالید لەدانیشتنەکەیدا ڕێك بوویەوەو کوپێ چای بۆ صالحی هاوڕێی تێکردوو پاشان ووتی: (صالح)گیان خۆت باش دەزانی من نزیکەی هەشت مانگە ژنم هێناوەو خۆم و خێزانم لەماڵێکداین پێکەوە بەتەنها دەژین.. بەڵام کێشەکە لەوەدایە برا بچوکەکەم (حەمەد) کەتەمەنی بیست ساڵە.. دواناوەندی تەواو کردووە و لەزانکۆ وەرگیراوە لێرە، دوای هەفتەیەك یان دوو هەفتە یەت بۆ ئێرە..

تا درێژە بە خوێندنەکەی بدات، لەبەر ئەوە دایکم و باوکم زۆر بەتوندی داوایان لێکردم کە(حەمەد) لەماڵی ئێمەبێت لەبری ئەوەی لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێکانی لەشوقەدا بێت، چونکە دەترسان سەرەڕۆ بێت و لەدەست دەرچێت.. وە خۆت دەزانیت ئەو شوقانە هەموو جۆرە مرۆڤێکی تیادا کۆبووەتەوە لەباش و خراپ و بەڕەوشت و فەوتاو.. وەك دەزانیت هاوڕێ سەرنج ڕاکێشە.. منیش زۆر بەتوندی ڕازیی نەبووم، چونکە وەك ئاشکرایە لەلات گەنجێکی هەرزەکارو بوونی لەماڵی مندا مەترسیەکی گەورەیە.. هەموومان بەقۆناغی لاوی و هەرزەکاریدا

ڕۆیشتووین.. باش دەزانین چۆنە.. هەندێ جار لەماڵ دەردەچم ئەو لە ژوورەکەیدا خەوتووە.. وە هەندێ جار بۆ چەند ڕۆژێ لەماڵ دەردەچم بەهۆی بارودۆخی کارەکەمەوە.. و هەندێ جار.. و هەندێ جار... نایشارمەوە لەلات من پرسیاری زانایەکی بەڕێزی ئاینیم کرد لەم بارەیەوە.. ئەویش ئاگاداری کردم کە ڕێگا بەهیچ کەسێك نەیەم با برایشم بێت.. تا بمێنێتەوە لەگەڵ من و لەگەڵ ژنەکەمدا لەماڵەکەدا.. وە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺی بۆ کردم لەو بوارەدا کە دەفەرموێ (الحَمُو الَمْوْت) واتە (هێوەر - شوبرا - مردنە) واتە مەترسیترین شت بۆ سەر ژن خزمانی نزیکی مێردەکەن، وەکو برای و مامی و خاڵی و کوڕەکانیان چونکە ئەو کەسانە زۆر بە ئاسانی دەچنە ماڵەوە و کەسیش گومانیان تێ نابات.. ئا لێرەوە سەرگەردان بوون پێیان مەزنترو مەترسیدارترە.

پاشان شاراوە نیە لەلات کاك(صالح) کە پیاو دەیەوێ لەگەڵ ژنەکەیدا بەتەنها لەماڵێکدا بێ.. تا بەتەواوی بحەوێتەوەو بە شێوەیەکی باشتر بژین پێکەوە.. ئەمەش

دەستەبەر نابێت ئەگەر (حەمەد)ی برام لەوماڵەدا بێت، خالید کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان قومێکی لە چاکەیدا کە لەبەردەمیدابوو.. پاشان وتی: کاتێ ئەمەم ڕوونکردەوە بۆ باوکم و دایکم و بۆچونی خۆمم بۆ شیکردنەوەو سوێندم بۆ خواردن بەخوای مەزن من هەموو کارێکی خێروچاك بۆ براکەم دەخوازم.. ئەوان تورەبوون لێم و لای خزمان هێرشیان کردە سەرم، تۆمەتباریانکردم بەوەی کە مافیانم نەداوە، وە بەوە وەسفیان کردم کە دڵم پیسەو نیەتم خراپە، چونکە گومانی خراپ دەبەم بە براکەم، لەکاتێکدا ئەو ژنی من وەکو خوشکی گەورەی خۆی تەماشا دەکات.. وە بەکەسێکی ئێرەیی پێبەر وەسفیان دەکردم و من چاکەی براکەمم ناوێت و نامەوێ خوێندنی زانکۆی تەواو بکات..

خراپتریش لەوە (صالح)گیان باوکم هەڕەشەی لێدەکردم و دەیوت: ئەمە فەزاحەتێکی گەورەیە لەناو خەڵکیدا.. چۆن براکەت لەگەڵ بێگانەدا بێت و تۆش ماڵت لەوێ بێت.. بەخوا ئەگەر(حەمەد) لەماڵەکەی تۆدا نەمێنێتەوە من و دایکت لەمڕۆ بەدواوە تا دەمریت دەت بوغزێنین و

ناتدوێنین و نەماندوێنیت.. ئێمە لـەدنیاو لەقیامـەتا بـێ بەرین لەتۆ.. (صالح) بەهێواشی کێشای بەسـەری خۆیـداو پاشـان وروتـی: بێگومـان تـۆ ڕای منـت دەوێـت لـەم مەسـەلەیەدا و زۆر بـە ڕاشـکاوانەو ئاشـکرا.. لەبـەر ئەوە(خالید) ڕێگام بدە پێت بڵێم تۆ کەسێکی دوودڵیت و ئەگەرنا پێویست بـەو هـەموو کێشەو ناکۆکیـە ناکـات لەگەڵ دایك و باوکت.. ئایا نازانیـت ڕەزامەنـدی خـوا لـە ڕەزامەنـدی دایـك و باوکەوەیـە ، وە توڕەبـوونی خـوا لـەتوڕەبوونی ئەوانەوەیـە ، چـی ڕوودەدات ئـەگر براکـەت لەیەك ماڵدا لەگـەڵ تـۆدا بـژی؟ کـاتێ تـۆ لـەوێ نیـت هەڵدەسـتێ بـە کاروبـارو پێداویـستی ماڵـەوە بەهـەر هۆیەکەوەبێت، کاتێ تۆ لەوێ نیت دەبێتە پیاوی ماڵەکە.

پاشـان صـالح کـەمێك بێـدەنگ بـوو تـا کاریگـەری قسەکانی ببینێت لەسەر ڕوخساری خالید، پاشـان ورتـی: من لێت دەپرسم بۆچی گومانی خراپ دەبەیت بە براکەت؟ بۆچی بێ تاوانان تۆمەتبار دەکـەیت بـەبێ بەڵگـە؟ ئایـا بیرت چوو کە پـەروەردگار دەفـەرموێ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ..... ﴿١٢﴾

(الحجرات).

واتە: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هەیە زۆر دووربکەونەوە لەگومان، بێگومان هەنێ لەگومانەکان تاوانن﴾.

پێم بڵێ ئایا متمانەت بە ژنەکەت نیە؟ ئایا متمانەت بە براکەت نیە؟

(خالید) پێی پچڕی ووتی: من متمانەم بەژنەکم و براکەم هەیە، بەڵام..

(صالح) پێی بڕی و بە لۆمەوە ووتی: گەڕاینەوە بۆ گومان و خەیاڵی خراپ..

دڵنیابە خالید، (حەمەد)ی برات دەبێتە شوانێکی دەستپاکی ماڵەکەت کاتێ تۆ لەوێیت و کاتێکیش لەماڵەوە نیت..

هەرگیز براکەت ڕێگا بە خۆی نادات نزیك بێتەوە لە براژنی خۆی، چونکە وەکو خوشکی خۆی تەماشای دەکات. تۆ لەخۆت بپرسە (خالید).. ئەگەر (حەمەد)ی برات ژنی

هەبوایە، ئایا تۆ بیرت لەدەستدرێژی دەکردەوە بۆسەر ژنەکەی یان زیانی پێبگەیەنیت؟

پێم وایە وەڵامەکە ئاشکرایە لەلات؟

خالید بۆچی براکەت و باوکت و دایکت لەدەست دەدەیت و خێزانەکەت پەرتەوازە دەکەیت لەپێناوی ئەندێشەو خەیاڵ و گومان و ئەگەرانێکدا کە بوونیان نییە.. عاقڵبەو باوك و داکیت ڕازیکە، تاوەکو خوای گەورە لێت ڕازی بێت.. وە بۆئەوەی گومان و دوودڵیت نەمێنێت ڕێنماییت دەکەم کە (حەمەد) لەبەشی پێشەوەی ماڵەوە نیشتەجێ بکەیت، وە ئەو دەرگایەی بەشی پێشەوەو ژوورەکانی تر جیا دەکاتەوە دایبخەیت.. (خالید) ڕازیی بوو بە قسەکانی (صالح)ی هاوڕێیی.. چارەی نەمابوو ڕازی بوون نەبێت بەوەی کە (حەمەد)ی برای بێنێتە لای خۆی..

دوای چەند ڕۆژێ (حەمەد) گەشتە فڕۆکەخانەو خالیدیش پێشوازیی لێکردو پاشان پێکەوە چوون بۆ ماڵی خالید تاوەکو (حەمەد) لەبەشی پێشەوە نیشتەجێ ببێت.. کار بەوشێوەیە گوزەرا.. ڕۆژگار بەویستی خوای گەورە

بەسەرچوو کە هەر زاتی خۆی زانا بوو بە هەمووشتیّ..
ئێستا ئێمە چوارساڵمان تێپەڕاندووەو (خالید) تەمەنی
گەشتووەتە (٣٠) ساڵ و بووە بە باوکی سیّ منداڵ..

(حەمەد)یش لە دواهەمین قۆناغی زانکۆدایەو
خەریکە خوێندن تەواو دەکات.. خالیدی برای بەڵێنی
پێداوە کە لەزانکۆ بیکات بە فەرمانبەر لە شوێنێکی
گونجاودا.. وە هەر لەماڵیاندا بمێنێتەوە تا ژن دێنێت و
لەگەڵ ژنەکەیدا بچنە ماڵی خۆیانەوە.

ئێوارەیەکیان خالید بە ئۆتۆمبێلەکەی دوای نیوەی
شەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.. بەیەکیّ لەڕێگاکانی گەڕەکەکەی
تەنیشتی ماڵەکەیاندا دەڕۆشت... لە دوورەوە دوو تارمایی
ڕەشی بینی کە لەتەنیشت ڕێگاکەدابوون.. نزیک بوویەوە
لێیان.. بینی پیرەژنێکی بەتەمەنە لەگەڵ کچێکدا کە
کەوتووە بە زەویداو کچەکە دەناڵێنیّ و هاوار دەکات، پیرە
ژنەکەش هاوار و واوەیلایەتی: (خەڵکینە پیاو چاکان
فریامانکەون، ڕزگارمانکەن)، خالید سەری سوڕما لەو
حاڵەتە.. حەزی دەکرد زیاتر نزیک بێتەوە لێیان و

پرسـیاریان لێ بکـات بۆچـی لەقـەراغ ئـەو ڕێگایـەدان، پیرەژنەکەش ووتی، کە ئەوان خەڵکی ئەم شارە نـین تـەنها هەفتەیەك نابێت نیشتەجێن لێرەو کەسیش لێرە ناناسـن و ئەم کچەش، کچی خۆیەتی و مێردەکەی سـەفەری کـردووە بۆ دەرەوەی شار بۆ ئیش کردن.. ئازاری ژان و منداڵ بـوون، پێش وادەی دیاریکردنی خـۆی زۆری بۆهێنـاوەو کـچەکەی خەریکە لەتاو سـەختی ئـازار دەمرێـت، و کەسـیش شـك نابەن بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە تا لەوێ کچەکەی منداڵی ببێت، پاشـان پیرەژنەکـە بەچـاوی پـڕ فرمێـسکەوە لێـی دەپاڕایەوە و دەیـوت: تکـات لێ دەکـەم، قاچـەکانت مـاچ دەکـەم چـاکەمان لەگەڵـدا بکـەو کـچەکەم بگەیەنـەرە نزیکترین نەخۆشخانە، خوای گەورە خێزانت و منداڵـەکانت لەهەموو ناخۆشـیەك بپارێزێـت.. فرمێـسکی پیرەژنەکـەو هاواری ئافرەتەکە کە کەوتبوو بەسەر زەویدا کاریان کـردە سەر دڵـی خالیـد، بۆیـە بـەهۆی پیـاوەتی و جـوامێری و یارمەتی لێقەوماوانەوە بەزەیی پیایاندا هاتەوەو ڕازیی بوو کـە بیانگەینێتـە نەخۆشـخانە، هەسـتا بـە هاوکـاری

پیرەژنەکە ئافرەتەکەیان خستە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە پاشان بەپەلە گەیاندنیە نزیکترین نەخۆشخانەی منداڵ بوون.. پیرەژنە و ئافرەتەکە بەدرێژایی ڕێگاکە دوعای خێرو سەرکەوتنیان بۆ دەکرد کە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵیەوە.

دوای کەمێك گەشتنە نەخۆشخانە، دوای تەواوبوونی ڕێو ڕەسمی یاسایی لەو جۆرە حاڵەتانەدا ئافرەتە برا بۆ ژووری نەشتەرگەریی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری، چونکە بەسروشتی منداڵەکەی نەدەبوو..

بەهۆی جوامێری و پیاوەتی و خاکیبوونیەوە خالید حەزی نەدەکرد بڕوات و ئەو پیرەژنە هەژارە جێ بێڵێت لەگەڵ کچە بێچارەکەیدا بەتەنها، تا دڵنیا نەبێت لەسەرکەوتنی ئەنجامی نەشتەرگەریەکەو لەدایکبوونی منداڵەکە بەسەلامەتی.. بە پیرەژنەکەی ووت: من چاوەڕوانی دەکەم لەهۆڵی چاوەڕوانی پیاوان.. و داوای لێکرد ئەگەر نەشتەرگەریەکە تەواوبوو، منداڵەکەش بەسەلامەتی لەدایك بوو مژدەی پێبدات.. بۆیە پەیوەندی

بە ژنەکەیەوە کرد لەماڵەوەو هەواڵی پێدا کە کەمێك دوادەکەوێت و دڵنیای کرد کە دڵی هیچ نەکات.

خالید لەهۆڵی (چاوەڕوانی پیاوان) دانیشت و پشتی نا بەدیوارەکەوە.. بۆیە خەو زاڵ بوو بەسەریداو هەستی بەخۆی نەکرد.. خالید نەی زانی چەنێك بەسەر کاتەکەدا تێپەڕیوە کە خەوتووە.. بەڵام ئەوەی کە بەتەواوی لەیادی ئەمدا نەبوو کە هەرگیز لەبیروهۆشیدا ناسڕێتەوە کە بەهۆی دەنگی قیژەوە بەخەبەر هات.. بینی دوو پیاوی ئاسایش لێی نزیك دەبنەوەو پیرە ژنەکە هاوار دەکات و بەدەستەکانی ئاماژە بۆ ئەم دەکات و دەڵێ: ئەوەتا.. ئا ئەوەتا... خالید سەرسام بوو لەو هەڵوێستە و لە شوێنی خۆی هەستایەوەو بەپەلە چوو بۆلای دایکی کچەکە و دەست پێشخەری کرد و بەتاسەوە ووتی: ئایا مندالّەکە بەسەلامەتی لەدایك بوو.. پێش ئەوەی پیرەژنەکە هیچ بڵێت.. ئەفسەری ئاسایش لێی نزیك بوویەوەو پێی ووت: تۆ (خالید)یت ووتی: بەڵێ.. ئەفسەرە ئاسایشەکە پێی ووت: دەمانەوێت پێنج خولەك بێیت بۆ ژووری بەڕێوەبەر..؟

هــــەموان چـــوونە ژووری بەڕێوەبـــەر، دەرگاکـــەیان لەسەرداخستن.. لەوێ پیرەژنەکە هاواری دەکرد و دەیکێشا بە ڕووخساری خۆیداو ڕوومەت و قژی خۆیی دەڕنی و هاواری دەکرد: ئەوە تاوانبارەکەیە، داواتان لێ دەکەم دەستبەرداری مەبن با نەڕوات.. ئای داخی گرانم بۆکچی خۆم... خالیدیش سەرسام بوو بوو.. هیچ تێنەدەگەیشت چی ڕوودەدات.. هەر سەرسام و ئەبلەق بووبوو، تا ئەفسەرەکە پێی ووت: ئەم پیرە ژنە دەڵێت: تۆ زینات لەگەڵ کچەکەیداکردووە و بە زۆر شەرەفت تکاندووەو سکی لەتۆ بووەو پاشان کاتێ کە هەڕەشەی لێ کردوویت کە نهێنیەکەت ئاشکرا دەکات و هەواڵ بە پۆلیس دەدات، تۆش بەڵێنت پێ داوە کە بیخوازیت، بەڵام پاش ئەوەی کە منداڵەکەی ببێت، پاشان منداڵەکە دابنێن لەبەردەم دەرگای یەکێ لەمزگەوتەکاندا تا خێرخوازێك بیبات و بیگەیەننە دەست خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی.!!! خالید بەبیستنی ئەم قسانە ڕاچڵەکی.. دنیا لەبەرچاوی ڕەش بوو.. هیچی نەدەبینی لەبەردەم خۆیدا.. قسەکان لە قورگیدا

وشك بوو بوون.. نەیدەتوانی قسە بکات و کەوت بەزەویداو لەهۆش خۆی چوو، دوای کـەمێك (خالیـد) هاتـەوەهۆش خـۆی و دوو پیـاوی ئاسایـشی بینـی لەگەڵیـدان لـە ژوورەکەداو ئەفسەرە پسپۆڕەکە پێی ووت: خالید ڕاستم پێ بڵێ: ڕوخسارت و سیمات وانیشان دەدەن کە تۆ کەسێکی بەڕێزیت و ڕواڵەتت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تـۆ لـەو کـارە قیزەونانەت ئەنجام نەیاوە..

خالید لەکاتێکـدا ئـازار سـوێی بـەدڵی بردبوویـەوە ووتی: خەڵکینە ئایا ئەمە داپاشـتی چـاکەیە، ئایـا بـەو شێوەیە پاداشتی چاکە دەدرێتەوە، من پیاوێکی شـەریف و داوێنپاکم، من ژنم هەیەو سێ منـداڵم هەیـە، دوو کـوڕم هەیە، سامی و سـعود و کـچێکیش و نیـشتەجێی ئێـرەم لەگەڕەکێکی ناسراودا.. خالید نـەیتوانی خـۆی بگرێـت و فرمێسك بەچاوانیدا هاتە خوارەوە.. ئەوانە فرمێسکی زوڵم و بێزاریی بوون.. فرمێسکی داوێنپاکی و ڕەوشـت جـوانی بـوون.. پاشـان کـاتێ خـۆی هێـورکردەوە.. خالیـد

بەسەرهاتەکەی خۆی بەتەواوی بۆ ئەفسەرەکان گێڕایەوە لەگەڵ ئەو پیرەژن و ئافرەتەدا..

کاتێ خالید لەقسەکانی بوویەوە.. ئەفسەرەکە پێی ووت: ئارامبە.. من دڵنیام کە تۆ بێتاوانی، بەڵام پێویستە کێشەکە بەڕێگای یاسایی چارەسەر بکرێت و پێوەیستە بەڵگەی بێتاوانیی تۆ دەرکەوێت و کارەکەش ئاسانە لەم جۆرە حاڵەتەی تۆدا.. ئێمە تەنها هەڵدەستین بە هەندێ شیکاری پزیشکی تایبەت کە ڕاستیمان بۆ دەردەخات! خالید پێی بچڕی: چ ڕاستیەك، ڕاستی ئەوەی کە من بێتاوانم و شەریفم و داوێنپاکم.. ئایا بڕوام پێناکەن.. سەگیش چاکەی لەگەڵدا بکەیت چاك دەبێت لەگەڵت، بەڵام زۆرێك لەخەڵکی ناپاکی دەکەن و خراپەکار دەبن بەرامبەر کەسێ کە چاکەیان لەگەڵ بکات.. بۆ بەیانی دەستیان کرد بە پشکنینی بڕێك لە (سپێرم)ی خالید و ناردیان بۆ تاقیگە بۆ پشکین و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پێویست.. (خالید) لەگەڵ ئەفسەرە پسپۆڕەکەدا دانیشت کە لە ژوورێکی تردا بوو.. بەردەوام دووعای دەکرد و پەنای

دەگرت بە خوا کە ڕاستی دەربکەوێت! دوای نزیکەی دوو سەعات ئەنجامی سەرسام هاتەوە.. شیکارە پزیشکیەکان دەریانخست کە خالید لەو تاوانە بۆ هەڵبەستراوە بێتاوانە.. خالید نەیتوانی لەخۆشیاندا خۆی ڕابگرێت و لەسەر زەویەکە سوجدەی شوکری برد بۆ خوای گەورە، کە پەروەردگار بێ تاوانی ئەمی دەرخست، ئەفسەرەکە داوای لێبوردنی کرد کە بوونە هۆی نارەحەتکردنی و پیرەژنەکەو کچە سۆزانیەکەیان نارد بۆ پۆلیسخانە بۆ بەدواداچوونی کێشەکەو گرتنەبەری ڕێ و شوێنی تەواو...

خالید پێش ئەوەی بڕواتە دەر لە نەخۆشخانە، سوور بوو لەسەر ئەوەی خواحافیزی لە پزیشکی پسپۆڕ بکات کە هەستابوو بە کارەکە، بۆیە چوو بۆ ژوورە تایبەتەکەی تا خواحافیزی لێ بکات و سوپاسی هەوڵ و ماندووبوونی بکات.. بەڵام پزیشکەکە پێی ووت: ئەگەر زەحمەت نەبێت چەند خولەکێك کارم پێتە بۆ شتێکی تایبەت.

پزیشکەکە کەمێك پەشۆکابوو، پاشان خۆی ڕاگرت و ووتی: لەڕاستیدا لەمیانی پشکنینەکاندا کە ئەنجامماندا

گومان دەبەن کە تۆ نەخۆشیەکت هەیە!!. بەڵام دڵنیا نیم لەوە، لەبەر ئەوە دەمەوێ هەندێ پشکنین بکەیت لە سەر ژنەکەت و منداڵەکانت تاوەکو گومانەکە ببێت بەڕاستی؟؟

خالید کەمێك ترسی لێ نیشت و ووتی: تکات لێ دەکەم دکتۆر پێم بڵێ چیمە.. من ڕازیم بەقەدەری خوا، بەڵام گرنگتر لای من منداڵە بچوکەکانمە، من ئامادەم لە پێناویاندا قوربانی بدەم، پاشان دەستی کرد بە گریان، پزیشکەکە دەستی کرد بە هێمن کردنەوەی و دڵنیاکردنەوەی و پاشان پێی ووت: من لەڕاستیدا ناتوانم ئێستا هیچت پێ بڵێم.. تا دڵنیا نەبم لە کارەکە.. لەوانەیە گومانەکانم لەجێی خۆیاندا نەبێ، بەڵام بەخێرایی ژنەکەت و هەرسێ منالەکەت بێنە.

دوای چەند سەعاتێك خالید ژنەکەی و منداڵەکانی هێنا بۆ نەخۆشخانە.. پشکنین و شیکاری پێویستیان بۆ ئەنجامدرا.. پاشان بە ئۆتۆمبێل ڕەوانەی کردنەوە و خالید خۆی گەڕایەوە تا کەمێك قسە لەگەڵ پزیشکەکەدا بکات..

کاتێ پێکەوە قسەیان دەکرد، مۆبایلەکەی خالید جەرەسی لێدا، ئەمیش هەڵیگرت و چەند خولەکێك قسەی کرد و دایخستەوە، دووبارە کەوتەوە ووت و وویژ لەگەڵیداو پزیشکەکە پێی ووت: ئەوە کێ بوو پێت دەوت نەکەی دەرگای شوقەکە نەشکێنیت؟!!

خالید ووتی: ئەوە (حەمەد)ی برام بوو.. لەهەمان شوقەدا لەگەڵ مندا نیشتەجێیە، کلیلەکەی خۆیی ون کردووەو داوام لێ دەکات بەخێرایی بڕۆمەوە تا دەرگاکەی بۆ بکەمەوە.. پزیشکەکە بەسەرسامییەوە ووتی: لە کەیەوە ئەو لەگەڵ ئێوەدایە؟

خالید ووتی: چوار ساڵەو ئەو ئێستا لەقۆناغی کۆتاییدایە لەزانکۆ.. پزیشکەکە پێی ووت: ئایا دەتوانی بانگی بکەیت تا هەندێ پشکنینی بۆ بکەین تا دڵنیا ببین ئایا نەخۆشیەکە زکماکیە یان نا؟! خالیدیش ووتی: زۆر بەدڵشادیەوە، سبەینێ دێینەوە بۆلات!!

لەکاتی دیاریکراودا خالیدو (حەمەد)ی برای ئامادەبوون لەنەخۆشخانە و پشکنین و شیکاری پێویست

بۆ (حەمەد) ئەنجامدرا، پزیشکەکە داوایکرد لەخالید کە دوای هەفتەیەك سەردانی بکاتەوە تا ئەنجامی کۆتایی بۆ دەردەکەویَ و دلّنیا دەبیَ لەهەمووشتیَ..

خالید بەدرێژایی ئەو هەفتە ڕاڕاو بێتاقەت بوو.

لەکاتی دیاریکراودا هاتەوە بۆلای پزیشکەکە کە بەگەرمی پێشوازیی لێکرد.. داوای شەربەتێکی لیمۆی بۆ کرد تا مێشکی هێور بێتەوە.. پاشان وردە وردە باسی ئارامگرتنی بۆ دەکرد لەسەر نەهامەتی و کۆستەکان و دنیا هەر بەو شێوەیە بووە!! خالید پێی بڕی و وتی: تکات لێدەکەم دکتۆر لەمە زیاتر دەمارم مەسوتێنە، من ئامادەم هەر نەخۆشیەکم تووش بووبێت، چونکە ئەوە قەدەری خوایە، ڕاستیەکەم پیَ بلّیَ؟

پزیشکەکە کەمێك سەری لەقاندو پاشان وتی: زۆرجار ڕاستیەکان ئازاراوی و تالّ و ناخۆشن!!.

بەلاّم دەبیَ بزانرێن و بەرەنگاریان ببینەوە!!

ڕاکردن لە بەرەنگاربوونەوە چارەسەری کێشە ناکات و واقیعیش ناگۆڕێت..

پزیشکەکە کەمێك بێدەنگ بوو.. پاشان بۆمبەکەی تەقاندەوەو ووتی:

- خالید تۆ نەزۆکیت و منداڵت نابێت!! ئەو سێ منداڵەش منداڵی تۆ نین بەڵکو منداڵی (حەمەد)ی براتن... خالید نەیتوانی گوێ لەو قسە جەرگ بڕانە بگرێت... هاوارێکی بەرزی لێوەهات کە نەخۆشخانەکە دەنگی دەدایەوە، پاشان کەوت و لەهۆش خۆی چوو.

دوای دوو هەفتە خالید هاتەوە هۆش خۆی تا هەموو شتێك ببینێت لە ژیانیدا کە دارماوەو تێکشکاوە.. خالید تووشی ئیفلیجی نیوەیی بوو بوو، عەقڵیشی لەدەست دابوو، بەهۆی سەختی کارەساتەکەوە، وە ڕەوانەی نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەروونیەکان کرابوو، تا ژیانی لەوێ بەسەر بەرێ هەتا مردن.

ژنەکەشی ڕەوانەی دادگای شەرعی کرابوو بۆ دان پیانانی تاوانەکانی و ئەنجامدانی سزای ڕەجم کردنی هەتا مردن.

(حەمەد)ی برایشی ڕەوانەی بەندیخانەکرابوو، چاوەڕوانی سزای شەرعی دەکرد، تا هەقی خۆی وەربگرێت.

سێ منداڵەکەش ڕەوانەی خانەی چاودێریی کۆمەڵایەتی کران تالەوێ لەگەڵ دۆزراوەکان و هەتیوەکاندا بژین.

وە سونەتی خوا (الحموالموت) هەر دەمێنێت وهیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت.. ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلاً ﴿٦٢﴾﴾ (الأحزاب).

واتە: (نابینیت گۆڕان بەسەر سوننەتی خوای گەورەدا بێت).

والحمد لله رب العالمين

## چیرۆکی ئازاردانی دایك و باوك

﴿١﴾

ئەم چیرۆکە یەکێك لە زەرنگەرەکان گێڕایەوە و ووتی پیاوێك لە گەڵ ژنەکەیدا هاتنە دوکانەکەیەوە لە دوایشدا دایکە پیرەکەی منداڵە بچکەکەی هەڵگرتبوو، وتی: ژنەکە دەستی کرد بە هەڵگرتنی ئاڵتون..پیاوەکە بە زەرنگەرەکەی ووت: پارەکەی چەند دەکات؟

زەرنگەرەکە ووتی: بیست هەزار و سەد ریاڵ

پیاوەکە ووتی: ئەو سەدە هی چیە؟

ووتی: دایکت موستیلەیەکی هەڵگرت کە بەسەد ریاڵە.. کوڕەکەشی موستیلەکەی لە دایکی سەند و فڕێیدایەوە بەسەر زەڕنگەرەکەدا و ووتی: پیرەژن ئاڵتونی ناوێت!!.

کاتێ دایکی گوێی لەم قسەیە بوو گریا و رۆشتە دەرەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە

ژنەکەشی ووتی: ئەوە چیت کرد؟ لەوانەیە لەمەودوا منداڵەکەت هەڵنەگرێت؟

پەنا بە خوا وەك خزمەتکاریان وابوو..

زەڕنگەرەکە سەرزەنشتی کرد و پیاوەکەش رۆشت بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە و بە دایکی وت ئەو ئاڵتوونەی کە دەوێت هەڵیبگرە،ئەگەر دەتەوێت موستیلەکە هەڵگرە.

دایکیشی وتی: نەبەخوا نامەوێت... بەخوا موسیلەم ناوێت، بەڵام ویستم دڵم شادکەم بە جەژن، وەك چۆن خەڵکی دڵیان شاد دەبێت، بەڵام تۆ شادیی منت مراند، خوا لێت ببورێت ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾ (الاسراء).

واتە: پەروەردگار بڕیاریداوە بێجگە لە ئەو هیچ شتێکی تر نەپەرستیٚ وە چاکەکار بن لە گەڵ دایك وباوکتان ئەگەر یەکێکیان(باوکت یان دایکت) یان هەردووکیان لای تۆ پیر بوون، قسەی ناخۆشیان پیٚ مەڵیٚ، تەنانەت ئۆفیش و تێیان مەخوڕە و پیایانا هەڵمەشاخیٚ بەڵکو بە ووتەی نەرم و شیرین لە گەڵیانا بدویٚ.

﴿٢﴾

ئـەم پیـاوەش خراپـەکارە و سەرپێـچی خـوا دەکـات و ئازاری باوکی دەدات و ناوی (مونازل)ـە رۆژێکیان بـاوکی هات بۆ لای و فەرمانی پێدا کە گوێرایـەڵی خـوا بێـت و چاکەکار بێت و وەڵامی پەروەردگار بداتەوە.

ئەزانی چیکرد!! چەپۆکێکی کێشا بە روخساری باوکیدا و باوکیشی دەگریا و دەیووت: بە خوا دەچم بۆ ماڵی خوا و لەوێ دووعات لێدەکەم.. باوکە رۆشت بۆ ماڵی خوا و بـۆ ئەنجامدانی حەج و دەستی گـرت بـە دیـواری کەعبـەوە و پاشان دەستی بەرزکردەوە و وتی:

یامن الیه اتی الحجاج قد قطعوا

ارضا کلاة من قرب و من بعد

هذا منازل لایرتد عن تحققی

فخذ بحقی یا رحمن من ولدی

وشك منه بحول منك بارحه

یالیت یابنی لم یولد ولم ألد

باوکە دەستی دانەگرت لە دووعاکردن خوای گــەورە کوڕەکەی ئیفلیج کرد و ئیفلیج بوو هەتاوەکو مرد.. پەنا بە خوای گەورە.

﴿۳﴾

ئەم پیاوەش بەم شێوەیە ئازاری باوکی دەدات... باوکی بــرد و خستیە سەر حوشترێك لە ناوەڕاستی بیابانێکدا و باوکی وتی کوڕی خۆم دەتەوێ چی بە من بکەیت؟

کور: بێزار بووم لێت

باوك: ئەی چیت دەوێت

کور: دەمەوێت سەرت ببڕم، باوکە بێزار بووم لێت

باوك: ئەگەر هەر دەتەوێ وا بکەیت لە پــاڵ ئــەو بــەردەدا سەرم ببڕە،

کوڕ: بۆچی باوکە،

باوك: چونکە منیش لە پاڵ ئەوبــەردەدا بــاوکم کوشــت، تۆش لەوێدا من بکوژە ئەوکاتەش یەکێ لە منداڵــەکانت تۆ دەکوژن لەوێدا.

خەڵکینە لەخوا بترسن، لە خوابترسن، لە خوا بترسن.

ئەی بەندەی خوا لە خوابترسە پاشان تەماشاکە بزانە چیت بۆ سبەینێ ئامادە کردووە... سبەینێ نزیك... لەوانەیە ئەمە شەوی کۆتایی بێت،

لەوانەیە سبەینێ نەبینیت،

لەوانەیە خۆر نەبینیت هەڵبێت بەسەرتدا،

لەوانەیە نەگەڕێیتەوە بۆ لای کەس و کارت،

لەوانەیە نەتوانیت ئەم چەند دێڕە بخوێنیتەوە،

نزیکترە لە چاو تروکانێك... بەڵکو ئەی بەندەی خوا مەرگ لەپڕ دێت، دەی لە خوابترسە، هەست بە دایك و باوكت بكە... لااله الاالله

سەرچاوە: (واحات الصحبة والصحابة)

## ئۆتۆمبیل و قورئانی پیرۆز

ئەم لاوە لە گەڵ باوکیدا دەژیا دوای وەفاتی کاتێك کە منداڵ بوو بە تەنیا دەژیا لەگەڵ باوکیدا

باوکی لە دەوڵەمەنترینی پیاوانی ئەو شارە بـوو، بـەڵام زۆر دەست قوچاو بوو لە ئاست کوڕەکـەی و زۆرکـەم و بـۆ پێویستی خەرجی دەدایە، لاوەکـە حـەزی لـە جۆرێـك لـە مۆدیلەکانی ئۆتۆمبیل بوو کـە زۆر گـران بـوو هەمیـشە خەوەنی پێوە دەبینی.. رۆژێکیان ئەو داواکاریەی ئاراستەی باوکی کرد.

باوکیشی وتی: دوای ئەوەی لە تاقیکردنەوەکاندا پلەیـەکی بەرز بەدەست بێنیت دیاریەکی بەهادارت پێشکەش دەکەم کە بەهاکەی زۆر لەبەهای ئەو ئۆتۆمبیلە زیاترە.

دوای دەرچوونی بەسەرکەوتوویی و پلەی باش، کوڕەکە چوە لای باوکی و وتی باوکە کاتی ئەوە هاتووە کـە دیاریەکـەم پـێ بـدەی.. باوکیـشی پاکـەتێکی پێـچراوی لـە کتێبخانەکەیدا دەرهێنا و پێشکەشی کوڕەکەی کرد.

کوڕەکەش وەریگرت و خەندە بە لێوانیەوە دیاربوو.. کاتێ کردیەوە بینی قورئانێکی پیرۆزە.

کورەکە تووشی شۆك بوو، پاشان فڕێیدا بەسەر باوکیدا و وتی ئەوە چیە؟ ئەم هەموو ماندووبوون و شەونخونیە بۆچی ئەی...؟

کوڕەکە لەماڵ چوویە دەرەوە ئیتر نەگەڕایەوە و دوای نزیکەی بیست ساڵ دوای وەفاتی باوکی کوڕەکە گەرایەوە بۆ ماڵەوە و ماڵەکە بووبوویە موڵکی ئەو، رۆژێکیان تەماشای کەلوپەلەکانی باوکی دەرکرد، قورئانەکەی بینی بەخەفەتەوە تەماشایکرد و پاشان گرتی بەدەستیەوە و کردیەوە و لەناو قورئانەکەدا کلیلی ئەو ئۆتۆمبیلەی بینی کە داوایکردبوو لەباوکی... بۆیە دەستی کرد بە گریان و شین و تووشی شۆك بوو!!.

لەو رۆژەوە ئەو لاوە نەیتوانیوە تاکە وشەیەك بێت بەزاریدا.

سەرچاوە: (واحات الصحبة والصاحبة)

## چیرۆکی سلێمان لە گەڵ ژنە چاکەکەیدا

لە شەقامی کورنیش بە ئۆتۆمبیلەکەی وەك پیشەی ئاسایی پیاسەی دەکرد، کاتێك کە بیویستایە لە ئاست پەستانی ژیانی رۆژانە پشوو بدات، لەو ساتەدا لە رادیۆی ئۆتۆمبییلەکەیەوە گوێی لە دەنگی ئەو گۆرانیبێژە کچەوە دەبوو کە حەزی لە دەنگی دەکرد و دەیووت (یا فؤادی لا تسل أين الهوى) وەك شێت حەزی لە دەنگی(أم كلثوم) دەکرد، زۆر دەگەشایەوە بە گۆرانیەکانی، کاتێ گوێی لە دەنگی بوو گۆرانی دەڵێت، خەیاڵ و ئەندێشەی دەفڕی بە ئاسماندا کە بنچینەکەی خەوەنەکان و مەبەستەکەشی(هیچ) بوو.

ئاساییە کە گەڕان و پیاسەکردن کۆتایی نایەت، ئەمە پێش گەیشتن بە ژمارەیە لە سەنتەرە بازرگانیەکان... گەڕانی ئەمجارەیان دیاربوو کەمێك جیاواز بوو لە گەڕانەکانی پێشووتر، چونکە ئەم جارە سلێمان چاوی نەدەبڕیە کچەکان تا یەکێکیان بگرێت و گاڵتەیان پێ بکات، بەڵکو ئەم جارە تەماشای ئەو پیاوانەی دەکرد کە

لـە گـەڵ خێزانەکانیانـدان... کـە نیـشانەی تـازەیی هاوسـەرگیریان پێـوە دیـاربوو!! تەنانـەت بیرکردنـەوەی ئەمڕۆشی وەکو ڕۆژان نەبوو، هەر کە پیاوێکی دەبینی لـە گەڵ ژنەکەیدا بـە خـۆیی دەوت(ماشـەڵڵا... بـە خـوا ژن هێنان شتێکی خۆشە، ئێستە ئـەوان لـەزەت لـە یـەکتری دەبینن).

بیرۆکەی ژن هێنان ماوەیەك بوو مێشکی سلێمانی تەنی بوو، زۆر بە لێبڕاوانە بیری لێـدەکردەوە، بـە تایبـەتی دوای ئـەوەی وەزیفەیـەکی باشـی دەسـت کـەوتبوو، داهـاتێکی جێگیری باشی هـەبوو، ئـەو ڕۆژە گەڕایـەوە بـۆ مـاڵـەوە و دایکی بینی و داوای لێکرد کە بێت بۆ ژوورە تایبەتەکـەی خۆی.

داواکاریەکە سەیر نەبوو بەلای دایکیـەوە، چـونکە ئـەو پێویستی بەوە هەبوو کە سەقامگیر بێت و ژیانی هاوسەری پێـك بێنێـت، پـێش ئـەوەی بـە هەڵـدێردا بـڕوات لـەم سەردەمـەدا کە پڕیەتی لە خراپەکاری و ئارەزووبازی.

کاتێ دایکی لێی پرسی کە مەرجەکانی چیە بۆ ئەو ژنەی کە دەیخوازێت؟ سلێمان وتی: دەمەوێت دیندار بێت و رواڵەتی هەبێت.

دایکی پێش ئەوە پێی دەوت: سلێمان ئایین لەمرۆدا گرنگترین شتە بۆ ئافرەت و من دایکی تۆم.. ئەو کچەی لە پەروەردگاری خۆی نەترسێت خێر ناداتەوە، سلێمانیش تەنها سەری راوەشاند کە نیشانەی رەزامەندی بوو بە قسەکانی دایکی بەلاّم تێنەدەگەیشت لە مانای ئەوە کە ژن دەبێت (دیندار و بە رەوشت) بێت.

سلێمان گەنجێکی صالح بوو، بەلاّم ئەوەی بیناسیایە دەیزانی کە لاوێکی مام ناوەندیە و جگەرە ناکێشێت.. و هاورێیەتی خراپ ناکات بەلاّم لە گەڵ ئەوانەشدا بێ گوناه نەبوو.

دوای چەند مانگێك لە گەڕان بە دوای ژندا بۆ سلێمان دایکی چووە ژوورەکەیەوە و پێی وت: ئەو ئافرەتە گونجاوەی کە ئەم دەیەوێت ئامادەیە و خوێندکاری زانکۆیە و دیندار و بەڕەوشتە و خەریکی کاری بانگخوازیە لە زانکۆدا یان

لە رێکخراوە خێرخوازیەکانی خوشکان لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا ئافرەتێکی زۆر جوانە.

سلێمان رازی بوو زەماوەند لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات و زەماوەند تەواوبوو سلێمان چووە کەژاوەی هاوسەرگیریەوە و ژیانی خۆشی و شادی دەستی پێکرد و وەك چۆن خۆی خوازیاری بوو، نیشانەکانی گۆڕان لە ژیانیدا دەبینرا، هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی نوێیەوە، لە شەوی یەکەمدا.. کاتێك کەوتبووە ناو خەوێکی قوڵەوە... ئای کە خەوی قورس بوو.. هەستی بە دەستێکی ناسك کرد کە رانەهاتبوو پێی، شانی راوەشاند: سلێمان سلێمان، هەستە نوێژی بەیانیە بانگبێژ بانگیدا.

سلێمان بە خۆیی وت: ئەم بەڵایە چیە؟ دەترسم هەر لە یەکەم شەوەوە دەست بکەین بە ناکۆکی.

سلێمان هەستا بۆ نوێژ، بە پاڵنەری شەرمکردن لە ژنەکەی، چونکە دەترسا هەر لە یەکەم شەوی هاوسەرگیریانەوە گومانی خراپی هەبێت لێی، سلێمان نوێژی بەیانیانی نەدەفەوتا بەڵام بە جەماعەت لە کاتی

خۆیدا نەیدەکرد ، کاتێك دەیکرد کە لــە خــەو هەڵدەســتا ، هیچ رۆژێك نوێژی نەفەوەتاوە.

سلێمان دەستنوێژی گرت و رۆشت بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردن، لەویّ لە رێگادا هەستی بە جیهانێکی سەیر کــرد! لە زووەوە نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام نــەداوە! ئــەو هێمنی و بێدەنگیەی کە هەستی پــیّ دەکــرد لــە رێگــادا ســەرنجی ئــەمیان راکێــشا ، کاتێــك بــە رێگــادا دەڕۆشــت پرسیارێك بەرۆکی گرت: من بەرامبــەر بــەم فــەرزە چیم ئەنجامداوە؟

پرسیارانێکی زۆر کەڵەکە بوون لە مێشکی سلێماندا ، وەك ئەوەی کەسێك لە متبونێکی درێژخایەنــەوە بــە ئاگــا هاتبێتەوە و تەنها لە متبوونی هاوەڵانی ئەشکەوت دەکات لە ئەشکەوتەکەیاندا.

ژیــانی ســلێمان بــە هێمنــی و ئــارامی تێدەپــەڕی.. رۆژێکیان کەناڵەکانی سەتەلایتی دەگوڕی بە کۆنترۆڵەکە ، بەرنامەکانی هەواڵ ســەرنجی ئــەمیان راکێــشابوو.. بــەڵام دیارە ئەوەی ئەو کەناڵانە دەگۆڕێت رێی دەکەوێت لــە شــتی

بێ ئەرزش و هەندێ جار بە هۆی زۆریی بەرنامە بێکەڵکەکانەوە کەسەکە ناچار دەبێت تەماشای ئەو شتە بێکەڵکانە بکات.

سلێمانیش هەر بەو شێوەیە بوو... رۆژێکیان ژنەکەی هاتە ژوورەوە و ئەمیش تەماشای بەرنامەیەکی بێکەڵکی دەکرد، بۆیە ئەو فرسەتەی قۆزتەوە و دەستی کرد بە ووتە سەرنج راکێشەکانی و بیرۆکە جوانەکانی و شێوازە سیحراویەکەی و مێردەکەی رازیکرد دەستبەرداری ئەو ئامێرە نەفرەتیە بێت و تەنها تەلەفزیۆنی ناوخۆیی سعودیەیان بەسە، تەنها بۆ تەماشاکردنی ئەو شتانەی شایەنی تەماشاکردنن.

سلێمان پێش ژن هێنانی هاوڕێیەکی نزیکی من بوو.. هەموو شتێکمان دەربارەی یەکتری دەزانی، هەر لە منداڵیەوە وا راهاتبووین، بەڵام دوای ئەوەی سلێمان ژنی هێنا دوورکەوتینەوە لە یەکتر، بە هۆی سەفەرکردنی بۆ کارکردن بۆ شارێکی تر.

دوای ساڵ و نیویێك گەشتمەوە بە سلێمانی.. هەرکە بینیم زۆر سەرسام بووم.. دیمەنی، هەمان دیمەنی هاوڕێ کۆنەکەی من نەبوو، وە قسە و هەڵسوکەوتیشی وانەبوو، لەو دیدارەیدا باسی رۆزیی خوای گەورەی بۆ کردم کە بە هۆی ئەو ژنەوە بەسەریدا رژاوە، کە توانی بە تەواوەتی گۆڕان بەسەر ژیانیدا بێنێت.. دوای ئەوەی کە نەیدەزانی چ ئامانجێکی هەیە لە ژیاندا و هەر وەکو گەشتیارێك وابوو لەم ژیانەدا، ئێستا هەست بە بەهای خۆی و ماڵ و منداڵ و کەس و کاری و کۆمەڵگاکەی دەکات .

ئازیزان.. بە سلێمانیان دەوت (ابو ابراهیم) باوکی ئیبراهیم وە ئێستاش ئەو ئیمامی مزگەوتێکە لەو شارەدا کە کاری تێدا دەکات و خەریکی چالاکی بانگخوازیە لەو شارەدا.

ئەمە بوو بەسەرهاتی ئەو لە گەڵ خێزانە صاڵحەکەیدا کە کردی بە شتێك دوای ئەوەی کە پێشتر هیچ نەبوو.

پێغەمبەر درووی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت (تنكح المراة لأربع، لِمالِها ولِحَسبِها و لِجَمالِها و لِدِينِها، فاظفر بذات الدين تربت يداك)

واتە ئافرەت لەبەرخاتری چوار شت دەخوازرێت بۆ ماڵەکەی و نەژادی و جوانی و ئایینەکەی دەی تۆ ئایینەکەیان هەڵبژێرە دەست پاراو دەبیت).

سەرچاوە : (واحات الصحبة الصالحة)

## ناتوانی لەمن بدەیت

منداڵێك لە پۆلی دووەمی بنەڕەتیدا بوو، بە کۆمەکی خوای گەورە و پاشان بە ئاراستە و پەروەردەی صاڵحانەی دایك و باوکی هیچ نوێژێکی بەیانی نەدەفەوتا و بە جەماعەت(کۆمەڵ) لە مزگەوتا ئەنجامی دەدا.. بەداخەوە ئەم دەرۆشت بۆ ئەنجامدانی نوێژ و باوکیشی خەوتبوو..

رۆژێکیان و لەکاتی وانەیەکدا لە قوتابخانە مامۆستاکە بڕیاریدا کە سزای هەموو قوتابیەکانی پۆلەکە بدات و بەهۆی شتێکەوە بوو.. بۆیە مامۆستاکە یەکەیەکە دەستیکرد بە لێدانی قوتابیەکان، تا گەیشتە سەرەی ئەم منداڵە.

مامۆستا: دەستت بکەرەوە! (دەیەویست لێی بدات).

قوتابی: نا، لێم نایەیت.

مامۆستا: ئایا گوێت لێ نیە، دەستت بکەرەوە.

قوتابی: دەتەوێ لێم بیەیت؟

مامۆستا: بەڵێ.

قوتابی: بەخوا تۆ ناتوانی لەمن بیەیت!!

مامۆستا: بۆچی؟

قوتابی: بەخوا ناتوانیت لەمن بیەیت، ئەگەر ئەتەوێ خۆت تاقیکەرەوە!!

مامۆستاکەش لە هەڵوێستی ئەو قوتابیە سەرسام بوو..

وتی: ئەی بۆچی ناتوانم لێت بدەم؟

قوتابی: ئەی گوێت لە فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ وە نەبووە کە دەفەرموێ: (مَنْ صَلَّى الفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ فَهُوَ فِي حِفْظِ اللهِ).

واتە: (ئەوەی نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات ئەوە لە پارێزگاری خودادایە).. وە منیش نوێژی بەیانیم بە کۆمەڵ کردووە، لەبەر ئەوە من لە پارێزگاری خودادام و تاوانێکم نەکردووە تا تۆ سزام بدەیت!!

مامۆستاکە وەستاو هەڵوێستەیەکی کرد و ملکەچیی زاڵ بوو بە سەریدا و سەرسام بوو لە دانایی ئەو منداڵە بچووکە و تەنها ئەوەندەی لە توانادا بوو کە هەواڵ بدات بە ئیدارە تا باوکی منداڵەکە بانگ بکەن و سوپاسی بکەن لەسەر باش پەروەردەکردنی منداڵەکەی... کاتێ

باوکی منداڵەکە هات، مامۆستاکان سەرسام بوون بە بینینی، چونکە کەسێکی لاموبالات بوو، وە هیچ نیشانەیەکی چاکە و ئیصلاح لە روخساریدا نەدەبینرا..

هەموان سەرسام بوون و لێیان پرسی: ئایا تۆ باوکی ئەم منداڵەیت؟

وتی: بەڵێ!

بەمنداڵەکەیان ووت: ئایا ئەمە باوکی تۆیە؟

وتی: بەڵێ، بەڵام لەگەڵ ئێمەدا نوێژ ناکات!!!

لەو کاتەدا یەکێك لە مامۆستاکان هەستا و بەسەرهاتەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، کە بووە هۆی رێنمایی کردنی باوکی

(منتديات المسافر)

## چیرۆکی لاوێکی سەیر

ئەمە چیرۆکێکی سەیرە و پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ هەموو لاوێك، یەکێ لە مامۆستا بەڕێزەکان بۆی گێڕامەوە.. کە بەسەرهاتێکی لاوێکی ناسراوە و هەموو لاوەکانی تر دەیناسن.. بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە بۆیان و وتی: من کەمتەرخەم بووم لە نوێژکردندا، یان با بڵێین رێگای مزگەوتم نەدەزانی.

پێش رەمەزانیساڵی(١٤٢٠)ك، لە ماڵەوە خەتبووم و لە خەونمدا خەوێکی سەیرم بینی، بینیم لەسەر جێگاکەم خەتووم و ژنەکەم هات و دەیویست خەبەرم بکاتەوە، منیش وەڵامم دایەوە چیت دەوێت؟ بەڵام موفاجەئەکە لەوەدا بوو کە ئەو گوێی لە قسەکانی من نەبوو، پاشان چەند جارێ ویستی خەبەرم بکاتەوە منیش هەر دەموت چیت دەوێت؟ بەڵام ئەو هەر گوێی لە قسەکانی منەوە نەبوو..پاشان بە ترسەوە رۆشت خوشك و براکانمی بانگ کرد و پزیشکیشیان لەگەڵدا بوو، پزیشکەکە دەستی کرد بە پشکنینم.. پێم ووت چیت دەوێت؟ بەڵام پزیشکەکەش

گوێی لە منەوە نەبوو، هەواڵیدا بە براکانم کە من مردووم، ئەوانیش تۆقین و دەستیان کرد بە گریان و لە کاتێکدا من نەمردبووم، بەڵام نەمدەزانی بۆچی گوێیان لە قسەکانمەوە نیە، چونکە حاڵەتی من زۆر نارەحەت بوو، ژنەکەم و خوشك و براکانم دەبینی و قسەم لە گەڵدا دەکردن و تەماشام دەکردن، بەڵام ئەوان قسەیان لە گەڵدا نەدەکردم، پاشان من گوێم لێیانەوە بوو، باسی ئەسپەردەکردنی منیان دەکرد و پەلەیان دەرد لە ناشتنمدا، منیان برد بۆ گۆڕستان منیش هەر کەسێکم ببینیایە لە رێگادا پێم دەوت من زیندووم و نەمردووم، بەڵام کەس وەڵامی نەدەدامەوە، پاشان کە منیان گەیاندە گۆڕستان پۆشاکەکانیان داکەندم و شۆردمیان و کفنیان کردم و بردمیان بۆ مزگەوت و من قسەم لە گەڵ ئیمامی مزگەوتەکەدا کرد و وتم من زیندووم و نەمردووم، بەڵام ئیمامی مزگەوتەکە وەڵامی نەدامەوە، تەنانەت من گوێم لەوانەوە بوو کە تەماشام دەکردن و پاشان نوێژیان لەسەر کردم و دوای نوێژەکە بردمیان بۆ لای گۆڕەکە، منیش

تەماشای خەڵکەکەم دەکرد و ئەوانیش دەیانویست دفنم بکەن و بمشارنەوە..

قسەم لەگەڵ یەکێکیاندا کرد وەك ئەوەی دۆستایەتی هەبێت لە نێوانماندا پێم وت من نەمردووم و زیندوم و دفنم مەکەن، بەڵام ئەویش وەڵامی نەدامەوە و پاشان خۆڵەکەیان بەسەردا کردم و دایان پۆشیم، منیش فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺم بیرکەوتەوە کە دەفەرمووێت: (إنَ المَيْتَ يَسْمَعُ قَرعُ النِعال). واتە (بەڕاستی مردوو گوێی لە دەنگی نەعلەکانیشەوەیە)، منیش بەڕاستی گوێم لە دەنگی نەعلەکانیشەوە بوو، کاتێ لەناو گۆڕەکەشدا بەجێیان هێشتم دوای ئەوە دڵنیا بووم کە من ئێستا لە شوێنێکی تاریکدام و لەبەردەم لێپرسینەوەیەکی گەورەدام، دوای ئەوە دوو پیاوی گەورە هاتن، بەڵام ترسێنەر بوون، یەکێکیان لای قاچمەوە وەستا و و ئەویتریشیان لای سەرمەوە، پرسیاری پەروەردگاریان لێکردم، منیش دەمەوت: پەروەردگارم... پەروەردگارم... من ئەمزانی پەروەردگارم کێیە!! بەڵام نەمزانی چۆن لەبیرم چوویەوە،

پاشان لێی پرسیم: پێغەمبەرت کێیە؟ منیش هەر دەمەوت: پێغەمبەری من... پێغەمبەری من... پاشان لێی پرسیم ئایینی تۆ چیە؟ منیش دەمووت: ئایینی من... ئایینی من... تەنها ژنەکەم و دووکانەکەم و منالەکانم و ئۆتۆمبیلەکەم دەهات بە خەیاڵمدا، پاشان گورزێکی گەورەی تێ سرەواندم و منیش پڕ بە بینم هاوارمکرد و ئەوەی لە ماڵماندا خەوتبوو خەبەرم کردەوە، ژنەکەشم بەردەوام هەر دەیووت بسم الله.. بسم الله.. بسم الله.

دەیووت بۆچی قیژانت و هاوارت کرد دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە ئەوە خەون بوو، راستەقینە نەبوو، پاش کەمێك بانگی بەیانی دا و ژیانێکی نوێ نوسرایەوە بۆ من... بەڕاستی ئەو خەوە بووە هۆی رێنوومایی و پابەند بوون و ملکەچی من و سەتەلایتەکەم شکاند و هەرچی شتی تری نابەجێ بوو شکاندمن.

سوپاس بۆ خوای گەورە، رووم کردە بارەگای پەروەردگار و پەرستنی خوای گەورە، ئێستا من لە گەڵ ژنەکەم و

منداڵەکانم و براکانم ژیانێکی خۆش و کامەران بەسەر دەبەین..

لە خوای گەورە داواکارم کە لە سەر گوێرایەڵیکردن خۆی بمرێنێت.

سەرچاوە: (الشباب بين العادة و العبادة)

شیخ عبدالله بن جبرين

## چیرۆکێکی سەیر بۆ هەموو جگەرەکێشێك

پێش دە ساڵ شوومکرد بە کوڕێکی جگەرەکێش، بە بێ ئەوەی کە بزانم جگەرەکێشە.. هەر چەندە رۆشنبیر و بەرێز و ئاکار جوانیش بوو، پارێزگاری نوێژەکانی دەکرد و کە ئەمە وای لێکردبووم خۆشم بوێت، بەڵام بە هۆی جگەرەکێشانی و بۆنی ناخۆشی و خۆی و پۆشاکەکانی هەستم بە دۆزەخێك دەکرد، هەوڵمدا کە واز لە جگەرەکێشان بێنێت، ئەویش بەڵێنی پێدەدام بەڵام پشت گوێ دەخست و کەمتەرخەم بوو... کارەکە بەو شێوەیە درێژەی کێشا هەتا رقم لە خۆم دەبوویەوە، لەناو ئۆتۆمبیل و لە ماڵەوە و لە هەموو شوێنێك جگەرەی دەکێشا، تا ئەو رادەیەی من بیرم لە تەڵاقدان کردەوە بە هۆی جگەرەوە.

دوای چەند مانگێك خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشین کە رێگر بوو لە بەردەم تەڵاقدا، منداڵەکەمان تووشی رەبۆ بووبوو پزیشکەکەش وتی هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ جگەرەکێشان، بە تایبەتی ئەوانەی دەورووبەری، چونکە باوکی لە پاڵیدا جگەرەی دەکێشا،

مێردەکەم دەستبەرداری جگەرەکێشان نەدەبوو.. شەوێکیان بەدەم کۆکەی سەختی منداڵەکەمەوە خەبەرم بوویەوە، بە هۆی رەبۆکەیەوە، منیش بە دیاریەوە بۆخۆم و منداڵەکەم دەگریام و بڕیارمدا بە هەر نرخێك بێت کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنم، بەلاّم لە ناخمدا بانگەوازێك بانگی دەکردم: بۆچی پەنا نابەیت بۆ خوای گەورە؟ منیش هەستام دەست نوێژم گرت و چەندە توانیم نوێژم کرد و لە خوای گەورە پاڕامەوە رێنمایم بکات بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم مەینەتیەدا و رێنمایی مێردەکەم بکات بۆ وازهێنان لە جگەرە و بڕیارمدا چاوەڕێ بم.

شەوێکیان سەردانی خزمێکمان کرد کە نەخۆش بوو، وە لە نەخۆشخانەی شاری (ریاض) کەتبوو، دوای دەرچوونمان لە سەردانی نەخۆشەکە و کاتی رۆشتنمان بەرەو گەراجی ئۆتۆمبیلەکان، مێردەکەم جگەرەی کێشا، منیش بیری دوعاکەم کردەوە بۆی و لە نزیك ئۆتۆمبیلەکەمانەوە پزیشکێکم بینی بە دوای ئۆتۆمبیلەکەیدا دەگەڕا لە پڕ پزیشکەکە نزیك بوویەوە لە مێردەکەم

و پێی ووت: من لە سەعات حەوتی بەیانییەوە لە گەڵ تیمێکی پزیشکیدا هەوڵدەدەم یەکێك لە قوربانیەکانی ئەم جگەرە نەفرەتیە رزگار بکەین لە نەخۆشی شێرپەنجەی سیی!! ئەویش لاوێکە لە تەمەنی تۆدا و ژن و منداڵی هەیە!!

خۆزگە ئێستە لە گەڵ من دەهاتیت تا بزانیت ئەو نەخۆشە چەندە گرفتارە، خۆزگە دەتبینی حاڵی منداڵە بچوکەکانی و ژنە گەنجەکەی چەندە گرفتارن، خۆزگە هەستت بە فرمێسك و ئەسرینی ئەوان دەکرد، هەموو سەعاتێك لێی دەپرسن تەندرووستی باوکیان چۆنە، خۆزگە هەستت بە حاڵی ئەو دەکرد کە لە ژووری چاوودێری وردایە ،کاتێ منداڵەکانی دەبینیت کە دەگرین و فرمێسکەکانیان دەتکێتە سەر ماسکی ئۆکسجینەکە، رێگامدا بە منداڵەکانی کە سەردانی بکەن، چونکە بە هۆی پسپۆڕیمەوە دەمزانی کە لە ماوەی چەند سەعاتێکی تردا دەمرێت و وەفات دەکات، مەگەر ویستی خوای گەورە وانەبێت و رەحمی پێ بکات... خۆزگە هەستت بەوە دەکرد

کـە چـۆن وەکـو مـنـداڵ دەگـری، چـونکە دەزانـێ لـە چ مەترسیەکدایە و بۆ هەتاهەتایی خواحافیزیان لێدەکات، ئایا حەز دەکەیت تۆش وەکو ئەوت لێبێت، ئینجا هەست بە مەترسی جگەرەکێشان بکەیت!!؟ برای بەڕێزم ئایا دڵت نیە، ئایا ژن و منداڵت نین!!؟ بۆ کێیان جێ دێڵیت!!؟ ئایا ئەوان لە جگەرەیەك بێ ئەرزشترن کە سوودی نیـە، تـەنها نەخۆشی و مەینەتی نەبێت.

مێردەکەم گوێی لـەو قسانەوە بـوو، چـەند سـاتێکی نەخایانـد مێردەکـەم جگەرەکـەی فڕێـدا و پاشـان پاکەتەکەشی فڕێدا.. پزیشکە دڵسۆزەکەش پێـی ووت: دەخوازم کە ئەم ڕەفتارەت رووکەش و موجامەلـە نـەبێت، بـەڵکو بـە راسـتگۆیانە بێـت و ئـەو کاتـەیش ژیـان و بەختەوەریی دەبینیت.

پاشان رۆشت بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەی و منیش قسەم بۆ نەدەکرا و حەپەسابووم، مێردەکەم دەرگای ئۆتۆمبیلەکـەی کردەوە و منیش چوومە ئۆتۆمبیلەکەوە و دەستم کـرد بـە گریان و نەمتوانی خۆم بگرم.. نەمتوانی هەستم بشارمەوە

و بە دەست خۆم نەبوو، هەر دەگریام، وەك ئەوەی مــن ژنــی ئەو پیاوە داماوە بم کە خەریکە دەمرێت.

مێردەکەشم بێدەنگی زاڵ بووبوو بەسەریدا و نەیدەتوانی ئۆتۆمبیلەکە بخاتە ئیش، تا ماوەیــەك بــەردەوام سوپاسـی ئەو پزیشکە دڵسۆزەی دەکرد، و ستایشی دەکرد و دەیــووت ئای کە پزیشکێکی دڵـسۆزە... مــن نــەمتوانی بەشــداری قــسەکانی بکــەم، تــا پــاش ماوەیــەك.. ئەمــە کۆتــایی بەسەرهاتەکەی ئەو بــوو لــە گــەڵ جگەرەکێـشاندا.. مــن ستایش و سوپاسی ئەو پزیشکە دەکەم و شــایەنی هــەموو رێزێکە و لەو رۆژەوە و لە هەموو نوێژێکدا دوعای خێــری بۆ دەکەم کە بەراستی ژیانی ئێمەی سپی کردەوە و رزگــارم بوو لەو کوێرەوەریە و مــن دووعــا بــۆ ئــەو و بــۆ هــەموو پزیشکێکی دڵسۆزی وەك ئەو دەکەم.

لەو رووداوەوە فێری فەزڵی دووعا و توانای خوای گــەورە بووم بۆ گۆڕانی بارودۆخەکان و فێــری فــەزڵی ئــارامگرتن بووم لە گەڵ دوعا و پارانەوە و ستایشدا و فێری ئەندازەیی نیعمەتی خوا بــووم کــە هــەر زاتــی خــوا خــۆی رێنمــایی

هەرکەسێ دەکات کە بیەوێت و فێری فەزڵی دڵسۆزی بووم لە گوفتار و کرداردا لەو پزیشکەوە کە چۆن هەستا بە رۆڵی خۆی لە کاتێکیشدا لە گەراجی ئۆتۆمبیلەکان بوو .. رای ئێوە چۆنە ئەگەر هەموو کەسێك هەستێت بە ئەرك و کاری خۆی بەو شێوازە بە دڵسۆزیەوە؟! ئەی چەندە لە کێشەکان چارەسەر بکرێن؟! و چەندە لە خراپەکاری و گوناهەکانت نەمێنێ؟! بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە زۆرێك لە پزیشکەکان و مامۆستایان و فەرمانبەران هەڵدەستن بە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان تەنها لە پێناوی مووچەدا، ئەوەیە هۆی دواکەوتنمان و هۆی لاوازی کاری پزیشکی و فێرکردن و کەڵەکە بوونی هەلەکان.

سەرچاوە: بدرية سليمان (مجلة الاسرة)

## چیرۆکێك سەر سپی دەکات

وەك باوكی پێی وتم چیرۆکێکە سەر سپیی دەکات....ئەم لاوە لە پۆلی نۆیەمی بنەرەتیدایە، باوكی شتی وای لێ بینیوە لە سەرسەختترین دوژمنیەوە نەیبینیووە، شەوێکیان هات بۆ لام و شکاتی حاڵی خۆی دەکرد و وتی: چی بکەم و باسی بەسەرهاتی ئەو کوڕەی بۆ کردم کە سەرسامی کردبووم.. خەریك بوو پێم بڵێت کە بیکوژێت بەڵام وامنەکرد.

لە هەندێ لە نارەحەتیەکانی ئەو باوکە ئەوە بوو کە وتی کوڕەکەم لە تاقیکردنەوەی مانگانەدا لە ٩٥٪ی بەردەکەوت، بە باوکی وت ئۆتۆمبیلێکی کابرسی مۆدیل(٢٠٠٢)م بۆ بکڕە، باوکیشی وتی: ئەگەر لە کۆتایی ساڵیشدا ئەو ئەنجامە بەدەست بێنیت، چیت بوێت دەدەمێ بۆ رازیکردنی ئۆتۆمبیلێکی بۆ کڕی بە (٢٥٠٠)ریاڵ، جۆری کابرس، بەڵام رازی نەبوو پێی، وە بە باوکی دەوت تۆ سەد هەزار ریاڵت لە من دزیوە کە ئەوە نرخی ئۆتۆمبیلەکەیە.

خێزانەکەیان رۆشتن بۆ سەر دەریـا ، داوای لــە کوڕەکــەی کرد کە لە گەڵیان بێت کوڕەکەشی وتی بـڕۆ مــن نایــەم، بۆیە لە ماڵەوە دەمایەوە و هەستا بـە شـکاندنی هـەموو شوشــەی ئــەو ماڵــە و هــەموو شــتەکانی نــاو مەتبــەخ، خێزانەکەشی گەڕانــەوە بــۆ ماڵــەوە، کوڕەکــە هەســتا بــە قفڵدانی دەرگا لەسەریان، باوکەش رۆشت بــۆ شــوقەیەکی تری ئامادەکراو و لەویٚ بۆ ماوەی دوو رۆژ مایــەوە و هــەر چاودێری کوڕەکەی دەکرد ، وەکو باسیان دەکرد هەندێ جـار لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و پاشان دەگەڕێتەوە، پاشــان باوکــە پــەنای بــردە بــەر پــۆلیس و ئــەوانیش لــە ماڵەکــەدا دەستگیریان کـرد و وێنــەی ماڵەکـەیان گـرت کـە مـرۆڤ گریانی دەهات، پاشـان بەنـدیان کـرد و ئێـستا ئـەو لـە بەندینخانەیە (مەبەستی کاتی گێرانەوەی چیرۆکەکەیە).

ئەمــە دوا حیکایــەت بــوو، وە پــێش رووداوی دوایــی باوکــە دەیــووت کوڕەکــەی رۆژێکیــان بــە شــەقامەکەدا دوایکەوت و داوای سەد ریاڵی دەکرد و باوکیــشی هــەوڵی دەدا کوڕەکەی لە خۆی دوور بخاتەوە، بەڵام کوڕەکەی رۆشت

و بەردێکی گەورەی هەڵگرت و بە خێرایی گەڕایەوە بۆ لای باوکی و کێشای بە ئۆتۆمبیلەکەدا، کاتێ دەیویست بە خێرایی لێبخورێت لە ترسی بەردەکە، و بە دایکی دەوت بە خوا دەستت ئەشکێنم ئەگەر سپلیتەکە بکوژێنیتەوە.. جارێکیان کوڕەکە بە باوکی ووت: بە خوا ئەتکوژم یان یەکێ لە مناڵەکانت ئەکوژم، جارێکیان باوکەکە ئاگای لە خۆی نابێت، کوڕەکەی لەقەیەکی بەهێز دەکێشێ بە پشتیدا و دەیووت بە خوا سوپاسی خوا دەکەم کە فەقەراتم ئازاری پێنەگەشت، ئیتر قسەی ناشرین بوەستێت کە باس ناکرێت، بە خوا من و دایکەکەی نەدەخەوتین هەتا دەرگامان لەسەر خۆمان دانەخستایە و دەمانچەکەشم لە ژوور سەرمدا دادەنا بۆ کاتی کتوپر.

ووتی بیرم لە کوشتن کردەوە، بەڵام من نامەوێت کەسێك بکوژم و لە رۆژی دواییدا لێپرسینەوەم لەسەر بکە، لە کۆتایدا باوکەکە وتی: بە خوا چێژم لە خەوتن نەبینیوە، تەنها دوای بەنکدردنی نەبێت، هەرچەندە پێش ئەم رووداوەش چەند جارێك داوەمە بەگرتن.

## شەیتان چوارەممان بوو

أبو عبدالله وتی: نازانم چۆن ئەم بەسەرهاتەت بۆ باس بکەم کە پێش ماوەیەك بەسەرمدا هات و ڕەوتی ژیانی منی گۆڕی بە تەواوەتی، لە ڕاستیدا من نەمویست باسی بکەم، بەڵام لە میانی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بە خوای گەورە باسی دەکەم و بۆ بەئاگاهێنانەوەی هەندێ لەو لاوانەی سەرپێچی پەروەردگاریان دەکەن و هەندێ لەو کچانەی بە دوای وەهمێکی درۆینەدا رادەکەن کە ناوی خۆشەویستیە.

ئێمە سێ هاوڕێ بووین، خەریکی کاری نابەجێ و گوناهکارانە بووین، نەخێر بەڵکو چوار بووین.. چونکە شەیتان چوارەممان بوو، هەموومان دەچووین بۆ ڕاوکردنی کچە چاو لە دەرەکان و بە قسەی هەنگوینیی هەڵمان دەخەڵەتاندن و دەمان بردن بۆ کێڵگە دوورەکان و لەوێش لە پڕ بۆیان دەردەکەوت کە ئێمە بووین بە گورگی بێ بەزەیی و گوێ ناگرین بۆ پاڕانەوەکانیان.. هەتا دڵەکانمان و هەستمان بە تەواوی مردبوو.

بەو شێوەیە لەکێڵگەکاندا شەو و رۆژمان بەسەر دەبرد لە خێوەتگە و ئۆتۆمبیلەکانی سەرکەنارەکان تا ئەو رۆژە هاتە پێشەوە کە بیرم ناچێت، وەك پیشەی هەموو جارێکمان رۆشتین بۆ کێلگەکە، هەموو شتێ ئامادەبوو، هەریەکەمان نێچیری خۆی پێ بوو لە گەڵ مەشروبی نەفرەتی.. تەنها شتێکمان بیرچووبوو، ئەویش خواردن بوو.

دوای کەمێك یەکێمان رۆشت بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی تا خواردنی ئێوارە بکرێت، کاتژمێر دەوروبەری شەش بوو، چەند سەعاتێکی خایاند هەر نەگەڕایەوە، لە سەعات دەی شەودا هەستم بە دلەڕاوکێ کرد، منیش بە ئۆتۆمبیلەکەم رۆشتم تا سۆراخێکی بکەم، کاتێ بە رێگادا دەڕۆشتم لە پڕ ئۆتۆمبیلی هاوڕێکەمم بینی ئاگری تێ بەربووە و کەوتووە بەسەر لا.. منیش وەك شێت رامکرد و هەوڵمدەدا لەناو ئۆتۆمبیلە گڕگرتووەکەدا هاوڕێکەم دەربهێنم، کاتێ بینیم نیوەی لەشی بووە بە خەڵوزیکی تەواو، بەڵام هێشتا گیانی تێدا بوو، هێنام و خستمە سەر زەویەکە، دوای خولەکێك چاوەکانی کردەوە و هاواری دەکرد ئاگر ئاگر.

بڕیارمدا بە ئۆتۆمبیەکەم هەڵیگرم و بە پەلە بیبەم بۆ نەخۆشخانە، بەڵام بە دەنگێکی گریاناویەوە ووتی: سوودی نیە ناگەمە نەخۆشخانە، فرمێسکیش بەربینی گرتبووم، کاتێ هاورێکەم دەبینی لەبەردەممدا دەمرێت، لەپڕ بینیم هاواریکرد: بڵیم چی؟ بڵێم چی؟ منیش بە سەرسامیەوە تەماشامکرد و لێم پرسی: کێ ئەڵێی؟

بە دەنگێك کە وات هەست دەکرد لە بیرێکەوە دێتەدەرەوە وتی: بە خوا!!. هەستم بە تۆقین کرد، کە سەراپای لەشمی داگیر کرد، لەپڕ هاورێکەم هاوارێکی بەرزی کرد و دواهەمین هەناسەیدا... رۆژان تێپەڕین و بەڵام وێنەی هاورێ کۆچکردووەکەم هەر لە بیر وهۆشمدا بوو، هاوری دەکرد و ئاگریش لووشی دەدا: چی بڵیم پێی؟ چی بڵێم پێی؟

منیش لە خۆمم پرسی ئەی من چی بڵێم پێی، چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك و لەرزێکی سەیرم لێهات، لە هەمان ساتیشدا گوێم لە بانگبێژی بەیانیەوە بوو بانگی دەدا: (الله اکبر.. الله اکبر.. حي علی الصلاة.. حي علی

الصلاة..) هەستمکرد کە ئەوە بانگێکی تایبەتە بـۆ مـن، بانگم دەکات بۆ رێگای رووناکی و رێنمایی، خۆمم شۆرد و دەسـتنوێژم گـرت و خـۆم پـاککردەوە لـەو هـەموو ئـەو پیسیانەی کە ساڵانێك بوو نوقم بووبووم تێیدا، دەستم کرد بـە نوێـژکردن... لـەو رۆژەوە نوێـژی فـەرزم نەفـەوتاوە و سوپاسـی ئـەو خوایـە دەکـەم کـە تـەنها ئـەو شـایەنی سوپاسکردنە و بووم بە مرۆڤێکی تر، پاکو بێگـەردی بـۆ ئەو خوایەی کە بارودۆخەکان دەگۆڕێت، بە ئیزنی خوا خۆم ئامادەکرد بڕۆم بـۆ ئەنجامـدانی عـەمرە و انـشاء الله بـۆ حەجیش کێ.. دەزانێ... تەمەن بەدەستی خوای گەورەیە.

ئەمە بەسەرهاتی(أبو عبدالله) بوو، خوای گەورە ئێمە و ئەویش دامەزراو بکات و تـەنها شـتێ کـە بـە هـەموو لاوێکی بڵێم ئەوەیە کە ئاگاداربن، ئاگـاداری لـە هـاوڕێی خراپ، ئەوانەی رێگات بـۆ خـۆش دەکـەن بـۆ بەزانـدنی سنوورەکانی خوای گـەورە... بەسـەرهاتی (أبـو عبـدالله) هەمووی پەند و ئامۆژگاریە، ئایا لەوە ئامۆژگاریتر هەیە.

## تەوبەی شیخ سەعیدی کوری مسفر

لە دیدارێکی کراوەدا لەگەڵ شێخ سەعیدی کوری مسفر - خوا پارێزراوی بکات- هەندێ لە ئامادەبووان داوایان لێکرد باسی سەرەتای ڕێنموونی خۆی بکات، ئەویش وتی: بەراستی هەموو ڕێنماییەك سەرەتایەکی هەیە و پاشان وتی: من بە فیترەتم باوەڕم بە خوا ﷻ هەبووە، کاتێ کە منداڵ بووم خواپەرستیم دەکرد، بەلاّم تەمبەڵی و پشتگوێ خستن کەمێك زاڵ بوو بەسەرمدا، بەو ئومێدەی کە گەورە بووم و بووم بە پیاو.

هەندێ جار نوێژەکانم پشت گوێ دەخست، بەلاّم ئەگەر ئامادە بوومایە لە ڕێوڕەسمی جەنازەیەك یان لە گۆڕستان یان گوێم لە ئامۆژگاریەکەوە بوایە لە مزگەوتێکدا ڕێژەی ئیمانم زیادی دەکرد و پارێزگاری نوێژەکانم دەکرد و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لە گەڵ سوونەتەکاندا، پاشان دوای هەفتەیەك یان دوو هەفتە وازم لە سوننەتەکان دەهێنا... دوای ئەوەی کە گەورە بووم و بووم بە هەرزەکار هیچ سوودێکم لەو تەمەنە نەگرت، بەڵکو مامەوە لە

سـەرەڕۆیی خۆمـدا و پارێزگـاری نـەکردنی نوێـژەکان بـە ووردی، چونکە ئـەوەی رابێـت لەسـەر شـتێك دەبێـت بـە پیشەی... ژنم هێنا.. ئەو کاتەش هەندێ جار نوێژم دەکرد و هەندێ جاریش نەمدەکرد، هەرچەندە لە ناخدا بـاوەڕم بـە خوا هەبوو... تا ویستی خوای گەورە وابـوو لـە یـەکێ لـە بۆنەکانـدا مـن لـە گـەڵ برایەکـدا بـووم، ئـەویش شـێخ سلێمانی کوڕی محمدی کوڕی فاتیح بوو خوا بەرکەت بخاتـە کاریەوە، ئەمە لە ساڵی ١٣٨٧ك، لە نووسینگەکەم هاتمە خوارەوە، من سەرپەرستیار بووم لە پـەروەردەی وەرزشـی و پۆشاکی وەرزشیم لەبەردا بوو، لەبەردەم دەرگای کـارگێڕی فێخوازی بینیم کە ئـەویش دادەبـەزێ لەبەشـی کاروبـاری دارایی، سڵاوم لێکرد، چونکە هـاورێی قوتابخانـە بـووین، دوای سڵاوکردن ویستم خواحافیزی لێبکەم، وتی: بۆ کوێ؟ ئەو کاتە رەمـەزان بوو پێم ووت: دەرۆمـەوە بـۆ ماڵـەوە تـا بخەوم.. چونکە راهاتبووم کە لە سـەر کـارکردن دەهاتمـەوە دەخەوتم هەتا مـەغریب و نوێژی عەسرم نەدەکرد، مەگـەر پێش مەغریب خەبەرم ببوایەتەوە و بەرۆژوو بوومایە.. پێی

وتم: نوێـژی عەسـر زۆری نـەماوە بۆچـی کـەمێك پیاسـە نەکەین؟ منـیش ڕەزامەنـدیم نوانـد و بـە پـێ ڕۆشـتین و چووینە سەر پردەکە (پردی دۆڵی ئـەبها) ئـەو کاتـە پـرد نەبوو، پڕ بوو لە درەخت و هەوایەکی خۆشی هەبوو، لەوێ دانیشتین هەتا کاتی عەسر هـات و دەسـتاین و نوێـژمان کرد و پاشان گەڕاینەوە، کاتێ بە ڕێگادا گەڕاینەوە دەستی بەدەستمەوە بوو، فەرموودەیەکی بۆ خوێندمەوە وەك ئەوەی یـەکمجارم بـێ بیبیسـتم، پێـشتر بیـستبووم، چـونکە فەرموودەیەکی بڵاو بوو.. بـەڵام کـاتێ دەیخوێندنـەوە دڵـم کرابووەوە بۆی، تەنانەت وام هەست دەکـرد کـە یەکـەمجارە بیبیستم... ئـەو فەرموودەیـە فـەرموودەی بـەڕائی کـوڕی عازب بوو کە ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا و ئـەبوداود لە (سنن)ـەکەیدا گێڕاویانەتەوە.

بەراوﷺ دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەری خـواﷺ لەگـەڵ جەنازەیەکی پیاوێکی پشتیوان(أنصار)دا دەرۆشتین بۆ سەر گۆرستان،کاتێ مردووەکـە ئەسپەردەکرا، پێغەمبـەرﷺ دانیـشت و ئێمـەش بەدەوریـدا دانیـشتین وەك ئـەوەی

باڵندەیەك بەسەرمانەوە بێت چیلکەیکی بەدەستەوە بوو سەری بەرز کردەوە و فەرمووی (پەنا بگرن بە خوای گەورە لە سزای گۆڕ)

دووجار یان سێ جار وتیەوە.. پاشان فەرمووی (إن العبد المؤمن إذا كان في إنقطاعٍ مِنَ الدُّنْيا وَ إِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ نَزَلَ اليه الملائكة مِنَ السَّمَاءِ بِيضُ الوُجُوهِ...) واتە( بەڕاستی بەندەی باوەڕدار ئەگەر پەیوەندی بە دنیاوە بپچڕێ و رووبکاتە ئاخیرەت فریشتەکانی خوای گەورە دادەبزنە سەری لە ئاسمانەوە و روخساریان سپیە...) پاشان فەرموودەکەی بە درێژی باسکرد و لە سەرەتاوە تا کۆتایی و فەرموودەکەی تەواو کرد.

لەو کاتەدا گەیشتینە ئەبها لەوێ دەبوایە جیابووینایەتەوە و هەریەکەمان بڕواتەوە ماڵی خۆی... منیش پێم ووت: برام لە کوێ ئەم فەرموودەیەت هێنا؟ وتی: ئەم فەرموودەیە لە کتێبی (رياض الصالحين) دایە و ووتم ئەی تۆ ئێستە چ کتێبێك دەخوێنیتەوە؟ وتی کتێبی(الكبائر)ی الذهبي دەخوێنمەوە؟ منیش

خواحافیزیم لێکرد و راستەوخۆ رۆشتم بۆ کتێبخانە و لەوکاتەدا لە ئەبها تەنها یەك کتێبخانەی تێدا بوو ئەویش کتێبخانەی(التوفیق)بوو، لەوێ کتێبی (ریاض الصالحین)م کڕی.. لە رێگادا تەماشای کتێبەکانم دەکرد و بەدەم رێوە بە خۆمم دەووت: ئێستا من لە سەرە رێگادام و دوو رێگە لەبەردەممدایە، رێگای یەکەم: بێباوەڕی و دووڕوویی و سەرپێچیە و دەمگەیەنێت بە دۆزەخ و رێگای دووەم: رێگای ئیمانە و دەمگەیەنیت بە بەهەشت، ئێستا من لە بەردەم هەردووکیاندا وەستاووم، کامیان هەڵبژێرم؟ عەقڵم فەرمانم پێدەدات کە رێگای یەکەم هەڵبژێرم و دەروونی خراپەکاریشم فەرمانم پێدەدا رێگای دووەم هەڵبژێرم و تکام لێدەکات و پێم دەڵێت: تۆ هێشتا لە سەرەتای لاوێتیدایت و دەرگای تەوبەکردن کراوەیە تا رۆژی دوایی، دەتوانیت دواتر تەوبە بکەیت،ئەو فیکر و وەسوەسەیە بە بیر و میشکمدا دەهات، کاتێ بەڕیگادا بەرەو ماڵ دەرۆشتمەوە، گەشتمەوە ماڵەوە، بەربانگم کردەوە و دوای نوێژی مەغریب نوێژی عیشام کرد و ئەو شەوە نوێژەکانی

تەراویحیشم کرد، بیرم نایە کە پێشتر نوێژی تەراویحم بەتەواوەتی کردبێت بێجگە لەو شەوە .. باوکم ببینیایە چوار رکاتم دەکرد و پاشان دەچووم.. بەلاّم ئەو شەوە نوێژەکانی تەراویحم بە تەواوەتی ئەنجامدا، لە نوێژ بوومەوە و دوای ئەوەی رۆشتم بۆ مالّی شێخ سلێمان بینیم لە دەرەوەی مزگەوتە، لە گەلّیدا رۆشتینەوە بۆ مالّەوە و ئەو شەوە لە سەرەتای کتێبی (الکبائر) چوار گوناهی گەورەمان خوێندەوە... گوناهی گەورەی یەکەم هاوەلّدانان بۆ خوا و دووەم سیحر و جادوو و سێیەم کوشتنی گیان و چوارەم وازهێنان لە نوێژ... پێش کاتی پارشێو لە خوێندنەوەی بووینەوە و بە هاورێکەم ووت: ئێمە لە کوێی ئەم ووتانە دەبین؟

ووتی: ئەمە لە کتێبی زانایاندا هەیە و ئێمە بێ ئاگاین لێی .. منیش ووتم: خەلّکیش بێ ئاگان لێی، پیویستە ئەم شتانەیان بۆ بخوێنیتەوە، ووتی:کێ بیخوێنێتەوە، ووتم: تۆ.. ووتی: نەخێر تۆ، کەوتینە مشتومڕی ئەوەی کە کێ بیخوێنیتەوە، پاشتر لەسەر ئەوە رێکەوتین کە من

بیخوێنمەوە.. بۆیە دەفتەرێکمان هێنا و باسی گوناهی گەورەی چوارەمان تێدا نووسیەوە، کە وازهێنان لە نوێژ بوو... لە هەمان هەفتەدا و لە رۆژی هەینی لە مزگەوتی (الخُشَّعُ الآعْلَى) وەستام کە بە تەنیشت سەنتەری بانگەوازەوە بوو لە (ئەبها) ئەوکاتە لە (ئەبها) تەنها ئەم مزگەوتە و مزگەوتی گەورەی لێبوو..

ئەو رۆژە لە وتاری هەینیدا خوێندمەوە و بۆ خەڵکی کاریگەر بوو، کە بەراستی هۆکارێ بوو سوپاس بۆ خوا بۆ رێنومایی و راست بوونەوەی من، وە خوازیارم لە خوای گەورە کە ئێمە و ئێوە چەسپاو و جێگیر بکات لەسەر ئایینەکەی، بەراستی هەر خوای گەورە بیسەر و وەڵامدەرەوەیە.

تەوبەیەك دڵی لاوێك لە تاریکیەکانی (بانکۆك) دا رووناك دەکاتەوە

لاوێك بیست و سێ ساڵی تەمەنی تێ نەپەڕاندبوو، سەفەری کرد بۆ بانکۆك بە دوای چێژ و تامی کاری حەرامدا... لەوێ دەستی کەوت بەڵام ئەگەر فەزڵ و

تەدارەك و چاودێری خوای گەورە نەبوایە کە لە دواهــەمین ساتدا فریای کەوت تیادەچوو...

لاوە کەنداویــەکان لــە (بــانکۆك) ئاشــنایان کــرد بــە حەشیش، چونکە جگــەرەی حەشــیش جیانەدەبوویــەوە لــە پەنجەو لێوی.

بۆیە لە ئەنجامدا وازیشی لە خوێندنی زانکــۆ هێنــا... ئەو حەشیشە نالەبارە ناچاری کرد خۆی سەرقاڵ بکات بــە پیشەیەکەوە... بەڵام چ پیشەیەك؟

خۆی دەڵێت ئێمە یانزە برا بووین، من یەکێك بووم لەو برایانەی کە لە ناو هەمویانەدا سەفەرم کــرد بــۆ ئــەوێ... سەفەری یەکەمم پێش نزیکەی ساڵێك بــوو دوای دانیــشتن لە گەڵ هاوڕێکانمدا کە باسی خۆشیەکانی (بانکۆك) یــان دەکرد!!! لە میانی یەك ساڵدا حەوت جار ســەفەرم کــرد، کە هەمووی دەیکردە نۆ مانگ!!!

سەرەتای گەشتی من لەگەڵ مــادە هۆشــبەرەکاندا لــە یەکەم گەشتدا بــوو بــۆ (بــانکۆك) لــە نــاو فڕۆکەکــەدا، کاتێك یــەکێك لــە هاوڕێکــانم کــە پێــنج کــەس بــوون و

منیشیان لە گەڵدا بووم، پەرداخێك بیرەی یا بە دەستمەوە، منیش گوێم نەیایە،بۆیە پێی ووتم: ئەم پەرداخەی تریش بگرە و ئەمەیان جۆرێکی تر دەبێت بەلاتەوە، منیش لە دەستم گرت، بۆیە ئەمە سەرەتای موعتاد بوونم بوو بە مادە هۆشبەرەکان، چونکە جۆرێك لە جۆرەکانی مادە هۆشبەرەکانی تێدا بوو کە پێیان دەووت (کنشە)

هەر کە گەشتمە وولاتی خۆمان ئۆتۆمبێلەکەم فرۆشت و گەڕامەوە بۆ بانکۆك... هەرکە گەشتمە ئەوێ پرسیاری (کنشە)م کرد... زۆر بە خەستی دەمکێشا... وازم نەهێنا بەڵکو ئەگەڕام و جۆرەکانی تری مادە هۆشبەرەکانم بەکاردەهێنا، بۆیە (کۆکاین)یشم تاقی کردەوە بەڵام سەرسام نەبووم پێی، وە هەروەها حەبی (کبتیجۆل)یشم تاقی کردەوە، بەڵام هەر حەزم لێ نەدەکرد. من بە دوای چێژو تامێکی تردا دەگەڕام کە لە کنشە بکات یان لەو باشتربێت بۆیە دەستم نەکەوت، سەرەنجام گەڕامەوە بۆ وولاتی خۆمان!!! لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانم کە

یەکەمجار گەشتم کردبوو لەگەڵیدا، لەوێ حەشیشم دەست کەوت و بەکارم هێنا.

نرخەکەی گرانتر بوو.. بە هۆی کەم دەرامەتیەوە ناچاربووم کە براکەم هەڵخەڵەتێنم، وای نیشان بدەم کە یەکێ لە هاورێکانم داوای پارەم لێ دەکات کە پێشتر قەرزم کردبوو لێ... بۆیە براکەیشم ئۆتۆمبێلەکەی خۆی فرۆشت و پارەکەی پێدام... منیش برێك حەشیشم پێ کڕی و سەفەرم کردەوە بۆ بانکۆك.

کاتێك گەڕامەوە بۆ وولاتی خۆمان، بە دوای جۆرێکی تردا دەگەڕام کە بەهێزتربێت لە(حەشیش)... سەفەرم کرد بۆ وولاتێکی عەربی بۆ بەدەست خستنی زەیتی حەشیش، لە گەڵ زەیتی حەشیشدا منیش بەرەو تیاچوون ڕۆشتم... نەمدەتوانی دەست بەرداری ببم... ڕۆچووبووم لە بەکارهێنانیدا... لە گەڵ خۆم بردم بۆ بانکۆك... ئەو جگەرەیەی کە چەورم دەکرد پێی لە لێوەکانم نەدەبوویەوە... لەوێ هەموان منیان بە موعتاد بوو بە حشیشەوە ناسی

بوو، لەشم توشی نەخۆشی مەترسیدار بوو بوو بە هۆیەوە... سوپاسی خوا دەکەم کە شیفای پێ بەخشیم...

هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاك دەبمەوە و ڕزگارم دەبێت لە زەیتی حشیش.

پارە تاکە کێشەی من بوو... لە کوێوە دەستم دەکەوێت؟ ناچار بووم پەنا بەرمە بەر ڕێگای دزی و ڕاو و ڕووت کردن... تا ئەو ڕادەیەی ریشم هێشتبوویەوە و پۆشاکم کورت کردبوویەوە تاوەکو نیشانی خزمانمی بدەم کە من گەڕاومەتەوە و تەوبەی تەواوم کردووە... بۆیە دەستم کرد بە قەرزکردنی پارە لێیان... دزیشم کرد لە خاڵم و مامم... هەندێ هاوڕێشم هاندا کە سەفەر بکەنەوە بۆ بانکۆك تا منیش لە سەر خەرجی ئەوان سەفەر بکەم لە گەڵیاندا... بەڵکو لە بانکۆکیش بووبوومە جەردە و دەستبڕ، دزیم لەو لاوانە دەکرد کە لە کەنداوەوە سەفەریان دەکرد و دەهاتن و دەستم دەگرت بە سەر کەلوپەلەکانیاندا... پیاوە بە تەمەنەکانی خەڵکی کەنداوم هەڵدەخەڵەتاند و فێڵم لێ دەکردن، پارەکانیانم چنگ

دەخست هەتا تایلەندیەکانیش بە زمانێکی تایلەندی شەق و شرِ هەلّم دەخەلّەتاندن و پارە و پولم لێ دەسەندن!!! بانکۆکم جێ نەهێشت، چونکە کارەکەم (مەبەستم پیشەی چەتەییە) لەوێ بوو

بەڕاستی بیرم لەژیانێکی سەقامگیری و هاوسەرگیری دەکردەوە لە گەلّ ئافرەتێکی تایلەندیدا، تا ڕەگەزنامەی تایلەندیم دەستِ بکەوێت و هەتا بەردەوام لەوێ بمێنمەوە..

لە بواری حەشیشدا بووبووم بە پسپۆڕ، دەمتوانی حەشیشی ساختە و حەشیشی ئەصلّی لە یەکتری جیا بکەمەوە... ڕۆژگار تێ پەڕین و هەرچیم هەبوو لە دەستمدا، کەسم شك نەدەبرد قەرزی لێ بکەم... هەموو براو هاوڕێ و خزمەکانم زانیبویان کە من دەستبڕم، کەسم شك نەدەبرد تا چاو ساغم بێت بۆ مالّ و سامانێك کە بیدزم دنیا لە بەرچاوما تەسك بوویەوە و پەتم هەلّخست خۆم بخنکێنم، دوای ئەوەی شوشەیك عەترم خواردبوویەوە تا سەرخۆشم بکات... بەلاّم براکەم پێی ووتم تۆ بێ ئەقلّیت، بۆیە بەو کارە تورِە بوو، دابەزیمە خوارەوە تا ووتوێژ بکەم

لەگەڵیدا، لە ئەنجامدا بۆی سەلماندم کە خۆکوشتن هیچ سودێکم پێ ناگەیەنێت.

سواری ئۆتۆمبێل بووم، سەرخۆش بووم و دوو شت لە مێشکمدا بوو، یان پۆلیس دەستگیرم بکات یان بڕۆم بۆ نەخۆشخانە و چارەسەری خۆم بکەم لەو حاڵەتی موعتادبوونەم کە گیرۆدەی کردبووم.

سوپاس بۆ خوا چووم بۆ نەخۆشخانە و چارەسەریان کردم...

ئەوەتا ئێستاش من تەندروستیم زۆرباشە و ڕزگاربووم لەو ڕەفتارە پیسە... تۆبەم کردووە و ئیتر هەرگیز ناگەڕێمەوە سەری.

## براکەی خۆمم کوشت

سـامی تاقیکردنـەوەی پـۆلی یەکـەمی ناوەنـدی بـە سـەرکەوتوویی بـڕی، و پـێش ئـەوەی ئـەنجامی تاقیکردنەوەکەی بزانێت لە باوکی پرسی: ئەو دیاریە چـیە کە بە هۆی دەرچوونی ئەمساڵمەوە پێشکەشمی دەکەیت؟

باوکیشی بە ئاسـودەییەوە وتـی: کـاتێ کارتەکـەت دێنیتەوە و سەرکەوتوو دەبیت، منیش ڕازی دەبم لـە گـەڵ خاڵتدا بچیت بۆ حەبەشـە، تـا پـشوی هـاوین لـەوێ بـە سەربەریت.

سـامی کـوڕە گـەورەی مـاڵ بـوو، دایکـی دوای چاوەڕوانیەکی درێژ ئەم کوڕەی بوو، دایك و باوکی بە نازەوە گەورەیان کردبوو، هەموان هەوڵیان دەدا ئاسودەی بکەن و داواکاریەکانی ڕاپەڕێنن و خۆشی و شادی بخەنە دڵیـەوە... سامی ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت لـە خۆشـیدا، چـونکە خەونە وەنەوشیەیەکان و یادگاری بەرائەتی منداڵی بە بیرو هۆشیدا دەهات، چۆن نا؟ ئەوەتا بـۆ یەکـەم جـار سـەفەر دەکات بۆ حەبەشە و سێ مانگی پشووی هاوین لـەوێ بـە

سەر دەبات... لەویّ لەزەت لە هەموو شتێکی تـازە و نـویّ دەبینێت.

لــە بەرەبــەیانی ڕۆژی ســێیەمدا تــا کاروبــاری تاقیکردنەوەکان کۆتایی پێبێنێت، سـامی لەگـەڵ بـاوکی چوو بۆ قوتابخانە تا کارتەکەی بێنێتەوە.

سامی چەند خولەکێك لە گەڕانەوەکەی دواکـەوت، باوکیشی لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا چـاوەڕێی دەکـرد، پاشـان کوڕەکەی گەڕایەوە و کارتەکەی بە دەستەوە بـوو، شـادیش بە ڕوخسارە بەرائەتەکەیەوە دیار بوو، هاواری کردو ووتـی: باوکە، مژدەم بەریّ دووەمی پۆلەکەمان بووم .

خەندەیەکی درێژیش داباریە سەر ڕوخساری بـاوکی، خۆشی و شادی بە ڕوونی بە چاوەکانیەوە دیار بوو، بـاوکی بەو پەڕی خۆشی و شادیەوە باوەشی پیـاکرد و پێـی ووت: هەزار... هەزار جار پـیرۆزت بێـت سـامی ئـازیزم، بـەڵکو ملیۆن جار پیرۆزت بێت ڕۆڵە ئازیزەکەم، سوپاس بۆ تۆ بـۆ ئەو سەرکەوتنەت .

کاتی سەفەرەکە نزیك بوو بوویەوە، سامی لەو پەڕی خۆشی و بەختیاریدا خوا حافیزی لە دایك و باوکی کرد، وە لەو فڕۆکەیەدا کە سامی بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا سواری بوو جیهانێکی نوێ و خۆشیەکی وای بینی، کە پێشتر خۆشی وای نەبینیبوو، خۆشیەك کە تێکەڵ بوو لە شادی و ترس بە تایبەتی کاتێ گوێی لە دەنگی ئەو فڕۆکەیە بوو کە نیشتەوە لە فڕۆکەخانەکەدا تا سەرلەنوێ بفڕێتەوە بۆ ئاسمانی بەرین و فراوان، هەر شتێکی دەبینی و گوێی لە هەر شتێکەوە دەبوو بە نیسبەت ئەمەوە تازە بوو... شتێکی نوێ ی بینی لە حەبەشە کە پێشتر ڕانەهاتبوو لە سەری، سامی بە هاوڕێیەتی خاڵی جیهانێکی تری نوێ ی بینی... لەوێ بە چەندین ئەزمونی ووروژێنەردا تێپەڕی، شتانێکی بینی کە پێشتر نەیبینی بوو.

بەڵام هەندێك جار و لە هەندێ کاتی دیاریکراودا هەستی دەکرد کە خاڵی تووشی حاڵەتێکی سەیر یەت، کە لاشەی هێزی تیا نامێنی و هاوسەنگی لە دەست دەدات... لە گەڵ ئەوەشدا هەندێ جار دەیبینی بەختیارە و دەم بە

خەندە و پێکەنینــە و هەنــدێ جــاریش کۆمــەڵێ ووشــەی ناحاڵی بە دەمیدا دێت.

سامی دەرکی بە نهێنــی ئــەو هەڵــسوکەوتە ســەیرەی خالّی کرد، کە بێگومان خالّی خوی بە عــارەق خواردنــەوە گرتووە.

سامیش لە ناخی خۆیدا حەزی لە لاسایی کردنەوە بــوو، شەیتانیش بەزەیی بە تەمەنە بچوکەیدا نەدەهاتەوە، بۆیــە وەسوەسەی خــستە دڵیــەوە تــا حەزەکــەی بــە شــێوەیەکی کردەیی تاقی بکاتەوە...

سامی بۆ یەکــەمجار عــارەقی خــواردەوە، لــە ســەرەتاوە سەرسام نەبوو پێی، بەلاّم کاتێ کە خالّۆی دەبینی و پاشان لاسایی کردنەوە کوێرانەکەی خۆیشی، پاڵی پێوەنا جارێـک و دوان و سیان تاقی بکاتەوە، تا ڕاهــات لــە ســەری و بــە تەواوی خووی پێوە گرت، لە کاتێکدا هێشتا ســیانزە ســاڵ بوو.

ماوەی پشووەکە تەواو بوو، ســامی بــە هاوڕێیــەتی خالّۆی گەڕایەوە بۆ (جــددە) کــە شــارێکە لــە عەربــستانی

سعودی، بیرو هۆشی هەر بەلای ئەوەوە بوو چۆن عارەقی دەست بکەوێت و بتوانێ بیخواتەوە، بەڵام هەروا بە ئاسانی نەدەیتوانی پەیدای بکات، لە کۆتاییدا بڕیاریدا کە بەتەواوی لێی دوور بکەوێتەوە، چونکە ئەوە تاکە چارەسەرە بۆ پارێزگاری خۆی و ئایندەی، ئەو هێشتا منداڵە، هەروەها کردەوەیەکی خراپە و خوای گەورە حەرامی کردووە و سزای سەختی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە عارەق دەخۆنەوە.

بۆیە بە تەواوی سامی گەڕایەوە بۆ ژیانی سروشتی خۆی و عارەقی لە بیر چوویەوە و سێ ساڵ بە سەر ئەو حاڵەتەدا تێپەڕی بە بێ ئەوەی بیر لە خواردنەوەی بکاتەوە... لە کۆتایی ساڵی چوارەمدا کەسوکارەکەی بڕیارياندا گەشتێك بکەن بۆ دەرەوەی وولات، بۆ بە سەر بردنی پشووی هاوین لە یەکێ لە وولاتە ئەورووپییەکان... لەو وولاتە سەر لەنوێ حەزە خەفەکراوەکەی زیندوو بوویەوە بۆ خواردنەوەی عارەق، یادگاریەکانی حەبەشە نوێ بوونەوە، بۆیە شەیتان عارەق خواردنەوەی لە بەر چاوی جوان و رازاوە کرد، سامی فرسەتی دەهێنا لەوکاتانەدا کە

کەسوکارەکەی لە ماڵ دەچوونە دەرەوە، یان کاتێک کە ئەوان دەخەوتن تا بە نهێنی دەست بکات بە عارەق خواردنەوە.

بەردەوام بوو لە سەر ئەو حاڵەتە، تا بە تەواوی ڕاهاتاوە لە سەری، بۆیە وەکو ئاو خواردنەوەی لێهاتبوو لە لای و نەیدەتوانی سەر لە نوێ دەستبەرداری بێت...

شەوێکیان (سامی) لەگەڵ (فەوزی) خاڵۆزایدا چوونە دەرەوە تا ئەو شەوە بە سەر بەرن لە یەکێ لە یانە شەویەکانی ئەوروپادا، دوای ئەوەی تێر نانیان خواردبوو دەستیان کرد بە عارەق خواردنەوە و گوێیان لەو مۆسیقا هەراسان کەرەش گرتبوو لە کافتریاکەدا...

کاتێ ئا لەو حاڵەتەدا بوون (فەوزی) شتێکی ڕەشی بچوکی لە گیرفانی دەرهێنا و لە سەرخۆ بە لەزەتەوە بۆنی هەڵدەمژی، وەك ئەوەی منداڵێکی ساوا ماچ بکات... جار ناجارێکیش بەلای ڕاست و چەپدا دەلەنجی .

سامی هەستی پێکرد و بە فزولیەوە لێ ی پرسی: ئەو پارچە رەشە چیە؟ ئەی بۆچی وا دەکەیت؟ فەوزی پێکەنی

و ووتی: ئایا نازانی ئەوە چیە؟ ئەوە حەشیشەی ڕەشە، مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوپەڕی لەزەت.سامی ووتی: ئایا ئەو شتە بچوکە ئەو هەموو کاریگەریەی هەیە؟

(فەوزی) ووتی: ئەوەی من پێم ووتی ئەوە بەشێکی ئەو ڕاستیەیە، دەتوانی تاقی بکەیتەوە تا خۆت حەقیقەتەکەت بۆ دەرکەوێ... هانێ تۆش تاقی بکەرەوە... دەستی درێژ کرد و حەشیشەیەکی ڕەشی یا بە سامی... سامیش حەشیشەکەی لێگرت و بۆنەکەی هەڵمژی و لە گەڵ ئەودا چوون بۆ جیهانێکی تری پڕ لە درۆ و وەهم و تیاچوون... سامی نەیدەزانی ئەو حەشیشە بچووکە تەڵەیەکە و پیایدا دەتەقێتەوە، و مردنێکە و هەموو ڕۆژێك تەقە دەیات لە دەرگای و هەڕەشە لە ئایندەیی و تەندروستی دەکات... چەند ڕۆژێکی نەخایاند سامی موعتاد بوو لە سەر حەشیش.

ژیانی بە تەواوی ژێرەو ژوور بوو... بە هۆیەوە تەندروستی تێکچوو و بیرو هۆشیشی پەکی کەوت.

لەو پێناوەشدا پارەو پولی نەما... کاتێکیش سامی خوێندنی تەواو کرد و بوو بە فەرمانبەر ڕقی لە خەڵکی دەبوویەوە و حەزی دەکرد دوورکەوێتەوە لێیان... لە دڵی خۆیدا وا هەستی دەکرد کە هەموو کەس نهێنی ئەم دەزانن و کەس نیە ئەم متمانەی پێ بکات... زۆر کەسێکی تووڕە و گرژ بوو.. زۆر نەوی بووبوویەوە بەسەر خۆیدا، هەژدە ساڵ تێپەڕی و ئەمیش دیلی ئەو حەشیشە ڕەشە بوو، هەرچەندە بە هۆی گۆڕینی پۆستەکانیەوە لە وەزیفەکەیدا مووچەیەکی باشی هەبوو کە یارمەتی دەدا بۆ خەرجی حەشیشەکەی، بەڵام کێشەکانی زۆر بوو بوون... تەنانەت لە گەڵ کەسوکاری و نزیکترین کەس لێیەوە... بۆیە باری ئابوری تەواو دابەزی بوو... سامی لە ناخی خۆیدا هەستی دەکرد کە بۆتە کەشتیەوانێکی ون بوو لە دەریایەکدا بە بێ کەنارە و ڕزگار بوونیشی نیە... سامی سوور بوو لە سەر ئەوەی نهێنی خۆی لای یەکێ لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی بدرکێنێت کە هاودەمی خۆی بوو بەڵکو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە... بەڵکو ڕزگاری بکات لەو دۆزەخە کە بەرگەی

ناگرێت... بۆیە بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ لای یەکێ لە هاورێ دێرینەکانی کە هاوەدەمی خۆی بوو، بەڵکو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە، هاورێکەشی بە دڵخۆشیەکی زۆرەوە پێشوازی لێ کرد و، لۆمەی کرد بە هۆی پچرانی پەیوەندیانەوە... سامی هەموو بە سەرهاتی خۆی بۆ هاورێکەی گێرایەوە کە بەهۆی ئەو حەشیشە ژەهراویەوە چی لێ بە سەر هاتووە، داوای یارمەتی لێکرد تا رزگاری ببێت لەو حەشیشە نەفرینە، کاتێ قسەکانی تەواو کرد، هاورێکەی پێی وت: من شتێکم پێیە هەموو ئێش و ئازارت هێور بکاتەوە! تەنها دەست درێژ بکە و چاوت بنوقێنە و بۆ ساتێك چاوەروانبە... سامی بە سەرسامیەوە وتی: چی دەڵێیت؟ من لە حاڵەتێکی زۆر خراپدام و کاتی گاڵتەو سوعبەت نیە.

هاورێکەی وتی: گاڵتە ناکەم، ئێستەش ئەنجامەکەی دەبینیت... کە سامی دەستی درێژ کرد و چاوی نوقاند ،هاورێکەشی دەرزیەکی (هیرۆین)ی یا لە باڵی، کاتێ

سامی چاوی کردەوە، هاوڕێ(ئامۆژگاریکەر)ـەکەی هەموو هێرۆینەکەی لە لاشەیدا خاڵی کردەوە...

لەگەڵ پەیدانی ئەو (هێـرۆین)ە دا سـەرەتای ئـازار و مەینەتی نوێ دەستی پێکرد بە نیسبەت سامی یەوە... لەو ڕۆژەوە سامی موعتاد بوو بە ( هێرۆین)ـەوە، نەیـدەتوانی دەستبەرداری ببێت، کاتێ بەکاری نـەدەهێنا هەسـتی بـە ئازارێك دەکرد کە خەریك بوو ئێـسکەکانی کلۆردەبـوون و نـەی دەتـوانی بەرگـەی بگرێـت... سـامی هەرچـی کۆکردبوویەوە بۆ (هێرۆین) خەرجی کرد... دەستی کردبوو بـە قـەرزکردن لـە کەسـوکار و هاوڕێکـانی، ئـەوانیش ڕاستەقینەیی شـتەکەیان نـەدەزانی، بـەڵکو ماڵەکەشـی خستە ڕەهنەوە.

کاتێ حاڵەتی تەندروستی بەرەو خـراپتر چـوو خرایـە نەخۆشخانە، دوای ماوەیەك لە نەخۆشخانە هاتە دەرەوە تـا سەر لە نوێ بگەڕێتـەوە بـۆ مـادە هۆشـبەرەکان... چـەند جارێك دەچووە نەخۆشخانە بەڵام سودی نەبوو.

شەوێکیان نەیتوانی بەرگەی ئازارەکە بگرێت لە لەشیدا بە هۆی پێویستی بوونی بە (هێرۆین) هیچ پارەیەکیشی نەبوو تا ئەو ژەهرە بکوژەی پێ بکڕێت، بەڵام هەر دەبێ بە هەر نرخێك بێت ئەو شەوە (هێرۆین) پەیدا کات... لەو کاتەدا باوکی لە سەفەر بوو، لەو ماوەیەدا هەڵسوکەوتی سامی شەڕەنگێزانە بوو وای لێدەکرد لە پێستی مرۆڤی و ئادەمی خۆی دەچوویە دەرەوە

ئەو شەوە کشومات و خەفەتناکە تا ڕادەیەك مانگە شەو بوو ، سامی لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و ویستی هەستێ بە کارێکی خراپ و مەترسیدار... سوور بوو لە سەر ئەوەی زێڕ وئاڵتونی دایکی بدزێت تا (هێرۆین)ی پێبکڕێت، چونکە بە تەواوی ئارامی نەمابوو... بۆیە سامی لە سەر خۆ ڕۆیشت بەرەو ژوورەکەی دایکی، دۆڵابەکەی کردەوە و هەندێ لە خشڵەکانی دایکی دزی تا بیفرۆشێ و( هێرۆین)ی پێ بکڕێت.

دایکی بە دەنگی دۆڵابەکە خەبەری بووەوە و شەبەحێکی لە ژوورەکەیدا بینی کە دەجوڵێتەوە، پڕ بە

بینینی هاواری کرد ( ئەوە دزە... ئەوە دزە) کوڕەکەش بەرەو لای دایکی ڕۆیشت لە کاتێکدا دەمامک بە ڕوخسارییەوە بوو ، دەمە پاکیزەکەی دایکی بە دەستە پیسە تاوانکارەکەی خۆی گرت، پاشان خستی بە سەر زەویدا، دایکیشی لە تاو ئەو ترس و تۆقاندنەدا کەوت بە زەویدا... سامیش ڕای کردو بۆی دەرچوو.

لەو کاتەدا برا بچوکەکەی بە دەنگی دایکی خەبەری بوویەوە و بە پەلە هات بۆ فریاکەوتنی تا ئەو دزە سەرتاپا ڕەشە ببینێت بۆیە دوای کەوت تا بیگرێت، لە ئەنجامدا توانی بیگرێت و هەردووکیان هەڵگژان بە یەکتریدا، بە ڕاستی ساتەکان ناڕەحەت و جەرگ بڕ بوون... دیارە سامی ئیشەکەی ئاشکرا دەبێت ئەگەر براکەی دەستگیری بکات، بۆیە شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد گورزێک بوەشێنێتە براکەی، سامی چەقۆیەکی کرد بە سنگی براکەیدا تا ڕزگاری بێت لە براکەی و لە فەزیحەتەکە... بە زێڕو خشڵەکانەوە رایکرد... بەڵام خوای گەورە لە بۆسەدایە بۆی... ئۆتۆمبیلەکانی پۆلیس لە گەڕان و دەوریەی ئاسایی

خۆیاندا بوون... یەکێ لە پۆلیسەکان سامی بینی کە بە پەلە لەماڵ هاتە دەرەوە و خەریك بوو دەکەوت بە زەویدا و سندوقێکی گەورەشی پێیە، بۆیە گومانی لێ پەیدا کرد و دەست بە جێ چووە سەری و دەستگیری کرد...

دوای ئەوە کوڕە بچوکەکەیان گەیاندە نەخۆشخانە، بەڵام ماڵ ئاوایی لە ژیان کردبوو... ڕۆحە بێتاوانەکەشی بەرزە فڕ بوو بوو بە هۆی ئەو چەقۆیانەوە کە ئاڕاستەی جەستە پاکەکەی کرا لە لایەن نزیکترین کەسەوە لێ ی کە برا گەورەکەی بوو.. هەموو کات خواردن و خواردنەوەی لە گەڵ دەخوارد و لە گەڵیدا دەخەوت و پێدەکەنی لە گەڵیداو دەچووە دەرو دەهاتەوە ماڵەوە لە گەڵی... بێگومان ئەوەیە ئاسەواری مادە هۆشبەرەکان .

دوای لێکۆڵینەوەی وردی دۆسیەکە... بەڕاستی هەواڵێکی چاوەڕوان نەکرابوو بۆ ئەو خێزانە... چونکە تاونبار و بکوژ (سامی) کوڕیانە و قوربانیەکەش دایکیان و کوڕەکە و ماڵە دزراوەکەیە.

بۆیە دایکە بەرگەی ئەو کۆستەی نەگرت و کەوتە ناو جێگا بە نەخۆشی و هەمیشە پیشەی گریان بوو، گریانی حەسرەت و پەشیمانی و ئازار پێکەوە بۆ (سامی)و کوڕە نازدارەکەی، کە ئایندەی دنیاو قیامەتیشی فەوتاند و لە بەر چاوی خەڵکیدا بوو بە کوڕێکی تاوانباری فەوتاوی دزی سەرەڕۆ...

سامی زۆر گریا... خەفەتی دەخوارد و پەشیمان بوو لە سەر ڕابردوی... بە هۆی حەشیش و تلیاکەوە هەمووشتێکی لە دەست دا... دینی لە دەست دا... وەزیفەکەی لە دەست دا... تەندروستی لە دەست دا. خێزانەکەی لە دەست دا... لە سەرو هەموو ئەمانەشەوە خۆشەویسترین و ئازیزترین کەسی خۆی کوشت، بەو دوو دەستە تاوانبارەی براکەی خۆی کوشت... سامی ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا بۆچارەسەرکردنی حاڵەتی موعتاد بوونەکەی بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا بەردەوام ئەوە لە بەرچاوی وون نابێت کە برا بچوکەکەی خۆی کوشت و هەموو ژیانی خۆی وێرانکرد بەهۆی مادەی بێهۆشکەرەوە... دەی خاوەن هۆشەکان پەندو

**ئامۆژگـاری لــەم بەســەرهاتەوە وەربگــرن** (فـاعتبروا یـا اولی الابصار)..

## لاوێك چاودێری خوای گەورە گرتیەوە

ئـــەم چـــیرۆکەتان لـــە ڕێگـــەی بـــانگخوازێکی متمانەپێکراوی باوەڕ بە خواوە بۆ دەگێڕمەوە... باسی لاوێك دەکەین نکولی لە ئاینەکەی دەکات و پەروەردگاری خۆی فەرامۆش کردووە و بێئاگا بووە لە خۆیشی... لە خراپی و سەرەڕۆییدا بە نمونە باسیان دەکرد، هەتا بە هۆی ئەوەوە کە ئازاری زۆری خەڵکی دەدا خەڵکێکی زۆر دوعایان لێ دەکرد کە بە هیلاکا بچێت و تیا بچێت تا ڕزگاریان بێت لە خراپەکانی.

هەندێ لە بانگخوازان ئامۆژگاریان دەکرد بەڵام وەری نەدەگرت، گوێ ی نەدەگرت لێیان، لە ناو تاریکیەکانی شەهوەت و ئارەزوودا دەژیا... یەکێ لە بانگخوازان چوو بۆ لای و ئەو بانگخوازە کەسێکی کاریگەری ڕاستەوخۆ بوو چەند ئامۆژگاریەکی کرد هەتا هێنایە گریان و وا گومانی دەبرد کە هاتووە بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بەڵام سودی نەبوو، دیسان وەك خۆی لێ دەهاتەوە وەك ئەوەی هیچیشی نەبیستبێت... نەیدەزانی

مزگەوت چیە، بەڵکو لە ڕۆژی هەینیشدا... دوای عیشا لە گەڵ پیرێکی وەکو خۆیدا دەچووە دەرەوە و کەمێك پێش بەرەبەیان دەگەڕایەوە و پاشان بە درێژایی ڕۆژ دەخەوت، وازی لە فەرمانبەری و کارەکەی هێنابوو... لەم دنیاو لەو دنیاشدا تاپول (افلاس) بوو بوو، دایکی هەمیشە چاو بە فرمێسکەوە دەبوو بۆ ڕەنجەڕۆیی و واقیعی کوڕەکەی بەڵکو زۆر حەزی دەکرد کە بمردایە.

بەدەم گۆرانیەوە دەخەوت و هەر بەوەیش خەبەری دەبوویەوە... چەندین وێنەی سێکسی و ڕەوشت نزمی لە لا بوو.. کە ئیمانی خەڵکی شارەکەی لە ناو دەبات.

بەڵکو دەرکەوتبوو کە موعتاد بووە بە مادە هۆشبەرەکانەوە و عەقڵ و ڕۆحی مەست بووە..

سەرەڕۆییەکەی بەرامبەر بە خوا درێژەی کێشا بوو، خوای گەورەش مۆڵەتی پێدابوو... تاوانەکانی زۆربوو بوون و ڕزقی خوای گەورەش دەورەی دابوو، گوێی لە هەموو شتێك دەگرت بێجگە لە قورئانی پیرۆز، وە لە هەموو شتێك تێدەگەیشت تەنها لە ئاین و دینداری دا نەبێت...

حەزی لە هەموو شتێك بوو تەنها زیکری خواو ئـەو جـۆرە شتانە نەبێت.

سـبحان الله دڵ چـۆن سـەرگەردان دەبێـت ئەگـەر خـوا نەناسێت... سبحان الله چۆنە هەست و نەست بێئاگاو گێل دەبێت ئەگەر پشت بکاتە خوای گەورە... ڕۆژە ڕەشەکانی بە تاوان و سەرپێچی دەبردە سەر، یەکێ لـە بـانگخوازە پیـاو چاکەکان بـیری لـە ڕێگایـەکی خـۆش دەکـردەوە تـا ئـەو سـەرگەردانە بێنێتـەوە ڕێگـای ڕاسـت، کـە بەڕاسـتی ڕێگایـەکی داهێنـراو بـوو، مـن لێـرەدا ئامۆژگـاری بانگخوازان و شاگردانی زانست و ئامۆژگاریکـاران دەکـەم کە ڕەچاوی ئەو شێوازە بکەن، ئـەویش ڕێگـای بـە دیـاری پێشکەش کردنـی کاسێت و سـیدی ئیـسلامیە کـە لـە ماڵەکانداو لە ئۆتۆمبێلەکاندا هەبێت... کاسێت و سـیدی ئیـسلامی کـە زانـست و سـەدا و کاریگـەری قـسەکەر دەگوازێتەوە بۆ گوێگر... بۆیە چەند کاسێتێکی پێـشکەش بـەو لاوە کـرد کـە کاریگـەربوون، ئـەویش وەری گـرت و خستیە ئۆتۆمبێلەکەیـەوە و گـوێی نـەدەدا بـە گـوێگرتن

لێیان.. گوێی لە گۆرانی و شتی بێ کەڵك دەگرت و بە ڕێگای خراپدا گوزەری دەکرد... پاشان ویستی کاسێتێکی ئیسلامی تاقی بکاتەوە و گوێی لێ بگرێت، تا بزانێت ئەو جۆرە کەسانە چۆن قسە دەکەن و شێوازی ووتار و قسەکردنیان چۆنە کاسێتەکە دەستی کرد بە ناردنی شەپۆلە زیندوەکانی ئیمان لە هەوایەکی ڕاستگۆیانەدا ڕاستەوخۆ بە کاریگەری و دڵسۆزی و بە شەپۆلێك کە پانتاییەکەی پەیامێکی نەرمە بۆ گوێگرانی.

لاوەکە گوێی لە شریتەکە گرت، ووتارەکە باسی ترسان لە خوای گەورەی دەکردو هەواڵی ئەوانەی کە لە خوا دەترسن... قسەکان گەیشتنە دڵی لاوەکە و لە دڵیدا سەقامگیربوون.. شریتەکە کۆتایی هات و لاوەکەش خۆی ئامادە باش کرد و پێداچوونەوەیکی خۆی کرد لە گەڵ خوای گەورەدا و هاتەوە بە خۆیدا و دەستی کرد بە لێدانی کاسێتی دووەم... کاسێتی دووەم باسی تەوبەکردن و تۆبەکاران بوو، لاوەکە بیری لە ڕابردووی خەفەتاوی و گریاناوی خۆی دەکردەوە، بەردەوام گوێی لە شریتەکە

گرت... گریانیش نمایشێك بوو بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاریەکان لە بەردەم دلّداو وەك ئەوەی زمانی حالّ ئەمە بلّێتەوە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ... ٢٤﴾ (الأنفال) واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە وەلاّمی خوا و پێغەمبەری خوا بدەنەوە، کاتێك کە بانگتان دەکەن بۆلای ئەو ئەو ئاینەی کە زیندووتان دەکاتەوە)

لە شاری (دەمام) نزیك بوویەوە، خەریك بوو کۆنترۆلّی ئۆتۆمبێلەکەی بۆنەدەکرا بۆ هۆی کاریگەری ئەو شەپۆلە ئیمانیەوە کە بە تەواوی هێنابوویە لەرزین...

چووە شارەکە و پێش ئەوەش ئیمان چووبووە دلّیەوە... ژیان لە دیدو بۆچونیدا گۆڕا، بە تێڕوانینێکی بەندەیەکی تۆبەکارەوە تەماشای دنیای دەکرد کە پێشتر وەك کەسێکی سەرسەخت و سەرەڕۆ دەیڕوانیە دنیا.

سەرەتا چووە مزگەوتەوە و ژیانێکی نوێی بە نوێژ دەست پێکرد و دەستی کرد بە تەمەنێکی نوێ ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾﴾ (الاسراء) واتە (وە بڵێ ئاینی راست هات و ئاینی ناهەق و بەتاڵنەما و رۆشت، بەراستی بەتاڵ هەمیشە لەناو چووە)

گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کاری بە بێ زیانی و بە دەسکەوتێکی مەزنەوە... بێ زیانی لە تاوانەکانی و دەسکەوتنی پەرستشەکان... چووە ماڵەوە بە ڕوخسارێکەوە جیا لەو ڕوخسارەی کە پێی هاتبووە دەرەوە، چونکە بە ڕوخسارێکی تاواناوی و گوناه و سەرکەشیەوە هاتبوویە دەرەوە و بە ڕوخسارێکی سپی و نوری و پەرستش و تەوبە و گەڕانەوەوە گەڕاوەتەوە.

کەسوکاری سەرسام بوون (فلاّن کەس ئەوە چیت بە سەر هاتووە؟ چی ڕوویداوە؟) باسی مەزنترین ڕووداوی ژیانی خۆی بۆ کردن:گەڕامەوە بۆ لای خواو تەوبەم کردو ئاشنا بوو بە ڕێگای گەڕانەوە بۆ لای خوا... چاوەکانی پڕ

بوو بوون لە فرمێسك و ئەوانیش لـە خۆشـیاندا دەسـتیان کرد بە گریان...

بەڵێ فرمێسکی خۆشی و شادی.

طفح السرور علي حتى انني *

من عظم ماقد سرني ابكاني.

واتە: خۆشی لێوان لێوم بوو بوو هەتا *

لە مەزنی ئەو خۆشیەدا منی هێنایە گریان.

ماڵەکەیان ڕووناك بوو بوویەوە و خەڵکیش پیرۆزباییان لە تۆبەکارەکە دەکردو مژدە بێت لێ ی بـۆ تەوبـەکردنی و گەڕانەوە بۆ لای خوا...

خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ (یا ابن ادم انك ما دعوتني و رجوتني الا غفرت لك مـا کـان منك و لا ابالي: یا ابن ادم لو بلغت ذنوبك عنان الـسماء ثم استغفرني غفرت لك و لا ابالي یا ابـن ادم لـو اتیـتني بقراب الارض خطایا ثم لقیتني لا تشرك بي شیئا لاتیتـك بقرابها مغفرة) رواه الترمذی

واتە (ئەی نەوەی ئـادەم بێگومـان تـۆ هـەرکاتێ لـە مـن پاڕابیتەوە و داوات لە من کردبێت لە هەموو گوناهەکانی

تۆ خۆش بووم و گوێشم نەیاوەتیێ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناهەکانت گەشتبنە ئاسمانیش پاشان داوای لێخۆش بوونت لێ کردبم، لێت خۆش بووم، و گوێم نەیاوەتیێ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بە پانتایی زەوی بە گوناهەوە هاتبیت بۆ لام و پاشان گەشتبیتبیت بە من و هیچ هاوەڵێکت بۆ من دانەنابێت منیش بە رادەی ئەوە دێم بۆ لای تۆ بە لێخۆش بوونەوە)

شباب عادوا الى الله

هەموو ئەم چیرۆکانە؟
بریتی نین لە خەیاڵ و ئەندێشەی
نووسەرێکی بە توانا و
دروستکراوی ئەدیبێکی
داهێنەر نین، بەڵکو رووداو
گەلێکن لەم جیهانەماندا
روویانداوە و پاڵەوانەکانیش
کەسانی راستەقینەن و لە سەر
ئەم هەسارە بچووکەمان دەژین،
ئەم چیرۆکانە ئەو راستەقینە
ئەمرەت نیشان دەدەن کە خوای
گەورە لە سەرووی تۆوەیە و
قەدەری ئەو چاوەڕوانی تۆیە، وە
هەر دەبێت رۆژێک لە رۆژان بێت
و بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و
دەربازبوون نیە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر

نرخی ٣٠٠٠ دینار